# چوارینەکانی خەییام

وەرگێڕانی مامۆستا هەژار



پەخشانگای ئازادی

٢٠٠٨ (١٣٨٧)

پەخشانگای ئازادی
Azadi Publication

**ناسنامە**

---

ناوی کتێب: **چوارینەکانی خەییام بە کوردی**
شاعیر: **عومەر خەییام**
وەرگێر: **هەژار**
نووبیار: **ماجد مەردۆخ ڕۆحانی**
پیتچنین: **موحەمەد سوڵتانیان**
ڕووبەرگ و ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان: **حەمیدڕەزا زەڕڕی**

## خەییام و چوارینەکانی لە زمان و وێژەی کوردیدا

چەرخی بیستەمی زایینی، چەلی سەر هەڵدانی ناوی خەییام و ناوبانگ دەرکردنی چوارینەکانی بوو، لە هەر چوارقوڕنەی جیهاندا. دوای ئەوە کە ئیدوارد فیتز جیرالدی[1] ئینگلیسی بە ماوەی چاردە سالان (١٨٥٩-١٨٧٢) سەد و یەک چوارینەی بە شێوەیەکی تایبەتی وەرگێڕایە سەر زمانی خۆی و خەییام و بیروڕای خەییامی بە هاوزمانانی ناساند، زۆری نەخایاند ئەو شیعرانە، وردە- وردە و یەک لە دوو یەک، بەرگی باقی زمانە ئورووپاییەکانیشی دەبەر کرا و هێشتا چەرخی بیستەم لە نیوە تێپەڕی نەکردبوو، بیر و بۆچوونی ئەو زانا هەڵکەوتەیە سەبارەت بە جەهان و مرۆڤ و کورتە مەودای ژیان و مەرگ و... لە دنیای پڕ هەرای ڕۆژاوای ئەو سەردەمەدا، سەری هەڵێنا و هەستی هەستیارانی ڕاچڵەکاند و هزری ڕووناکبیرانی ڕاهەژاند.

سەیری خۆش لەوەدایە خەییامی شاعیریش ـ وەکی بووعەلی سینای بژیشکـ پێشتر لە ڕۆژاوادا ناسرا و ناو و ناوبانگی بەرزەوە بوو، ئەمجار ڕۆژهەلاتیان و تەنانەت فارس زمانانیش نابیانەوە! جا ئەگەر بێژین «القانوون

---

١. EDWARD FITZGERALD (١٨٠٩ -١٨٨٣) ، هەستیار و وەرگێڕی بەناوبانگ، کە سالی ١٨٣٠ لە زانستگای ئاکسفورد دوکتورای وەرگرت و پاشان دوورەپەریزی لە خەلک و کۆمەلگای هەلبژارد و لە سای ئەم شێوە ژیانەوە، بۆی ڕەخسا چەند زمان فێر ببێ و زۆرێک کاری بایەخدار ـ لە نووسین و وەرگێڕان ـ بەدی بێنێ. بەلام شاکاری گەورە و هێژی شۆرەتی دنیایی فیتز جرالد، پاچڤەی چوارینەکانی خەییام و هۆنینەوەیان وەکوو داستانی ڕۆژێکە ـ لە بەرەبەیانەوە تا درنگانی شەوـ لە ژیانی خەییام.

فرهنگ و ادبیات جهان، زهرا خانلری. منظومەی خیام‌وار فیتزجرالد، مسعود فرزاد.

فی الطّب»ی بووعەلی، بە بۆنەی بە زمانی عەرەبی و یەکجار دژوار بوونیەوە، زۆربەی زۆری فارس زمان سەریان لێ دەر نەدەکرد و ماوەی هەزار ساڵ لەو تاک و تەرایەش تێدەگەیشتن، کەسی وایان لێ هەڵنەکەوت بۆیانی بکا بە فارسی، نازانم بۆ دیسـان نێزیک بە هەزار سـاڵ ئاوڕ نەدانەوە و بایەخ نەدان بە چوارینە یەکجار جوان و ڕازاوەکانی خەییام _ کە ئەمجار هەر بە زمانی فارسین_ چ بیانوویەک دەکرێ بتاشین و چۆناوچۆنی دەتوانین پاسا بکەین؟!

جا بەو پێیە ئێمەی کوردیش کە چاومان لە خاوەن ماڵ بڕیوە، هەر لەم دوایيانەدا خەییامی شاعیرمان ناسیوە و وێژەوانان و هەستیارانمان، دوای وەرگێڕانی بە زیاتر لە سی زمان، ناویان بیستووە و پێیان زانیوە!

سەبارەت بە خەییام و چوارینەکانی، ئەوی شیاوی گوتن بێ، مامۆستا هەژار لە پێشەکیە ڕازاوەکەیدا _ بە ناوی «خەییام و بیر و باوەڕی»_ فەرموویەتی و لە چەند لاپەڕەی‌تردا دەیخوێننەوە. بە ڕای من لەوە ڕێک و پێک‌تر و ڕەسا و پەساتر ناگوترێ. ئەوی لێرەدا شیاوی باسە، کورتە مێژووییێکە لەمەڕ چۆناوچۆنی وەرگێڕانی ئەو شیعرانە بە زمانی کوردی.

ئەگەر بەشوێن کەسانێکدا بگەڕین کە چوارینەی خەییامیان وەرگێڕاوە، ناوی مامۆستایان: «کامران عالی بەدرخان»، «شێخ سەلام»، «گۆران» و چەند کەسی تر و پاش هەمووان «هەژار»مان دێتە بەرچاو. ئەمن کاری شێخ سەلام و مامۆستا گۆرانم دیوە کە هێناویانەتە سەر کێشی بیست بڕگەی چوار بڕشت؛ یانێ کێشی هەمۆو شیعری فۆلکلوری کوردی و زوربەی دوو خشتەکیەکانمان. شێخ سەلام ٢١٤ چوارینەی کردۆتە کوردی و خوا هەڵناگرێ هێندێکیانی زۆر جوان هێناوەتەوە. گۆران ٦١ چوارینەی وەرگێڕاوە؛ کە زیاتریان لە لایەن خەییام ناسەکانەوە بە هی خەییام ناسراون

و له دیوانی مامۆستاشدا ئەچنە ڕیزی ئەو شیعرانە کە بۆ دڵی خۆی دایناوە و له کێش و قافیە زیاتر گرفتێکی تری نەبووە![1]

باس له چۆناوچۆنی ئەم شیعرانە و بەرامبەر کردنەوە و هەڵسەنگاندنیان، له کتێبی بایەخداری «خەییامی هەژارانە»، لێکۆڵینەوەی دۆستی هێژام کاک «سەلاحی ئاشتی»، بە تێر و تەسەلی هاتووە. ئێرە نە جێی ئەو کارەیە و نەش له سەرینەی ئەو کتێبەدا، دووپاتە کردنەوەی پێویستە. تەنیا بۆ نموونە له هەرکام دوو چوارینە چاو لێ دەکەین:

**له مامۆستا شێخ سەلام:**

ئەم گۆزە وەک من عاشقێ بوو زار
بە تاڵی زولفی یارێ گروفتار
ئەو دەستە ئێستە تەوقی ملیەتی
دەستێ بوو، کام دەست؟ دەستی مـلی یار

***

دەسمایەی عومرم له دەستم دەرچوو
بە پەنجەی ئەجەل جگەر کون_کون بوو
ناگەڕێتەوە کەسێ لەو دنیا
تا لێی بپرسین ئەحواڵی مردوو

---

۱. دیوانی گۆران، چاپی پانیذ، ۱۳۸٦، ل۳٦۷ تا ۳۷۳ .

**لە مامۆستا گۆران:**

ئەم گۆزە وەک من دڵداریێ بووە
گیرۆدەی زولفی نیگاریێ بووە
ئەو دەسکەی ئێستا قوڵفە لە ملیا
سەردەمێک دەستی مل یارێک بووە

***

هەی داخ دەسمایە لە چنگمان دەرچوو
لە دەست مەرگ گەلێ جگەر کون_کون بوو
خۆ کەس لەو دنیا نایە لێی پرسم
ئەنجامی کاری زووتر کۆچ کردوو

**ئەمجار با بینە سەر باسی ئەم کتێبە:**

پێشەکی با لەبیرمان بێ، بیری ورد و قووڵی خەییام، ئاکامی وردبوونەوەیەکی زانایانەی درێژخایەنە لەم دنیا ـ بە ڕواڵەت ـ بێ سەر و بن و بێ تان و پۆیە و سەر هەڵدانی پرسیارێکی بێ ئەژمارە لە مەڕ مرۆڤ و ژیان و چۆناوچۆنی هاتنی و بۆ ماوەیەک مانەوەی و ئەمجار چوون و نەمانی لە سەر ئەم جیهانە و ... دیارە بیری وا ـ وەک ئێژن ـ سەر لە زگی برسی نادا و مەگەر چۆناوچۆن ئەگینا کەسێک ئەکەوێتە ناو بۆچوونی وا قووڵ و بەڵکوو بێ بنی ئەم خەیالاتە، ئارخەیان لە ژوورێک پاڵی دابێتەوە و کار و باری ژیانی لە گش بارێکەوە دابین بووبێ و هیچ خشەیەک داینەچڵەکێنێ و هیچ وسەیەک ئیسراحەتی نەشێوێنێ. جا بۆیە دەڵێن فیلەسووفان لە سروشتی دەولەمەند و سازگاردا ڕاهاتوون، کە هەموو شتێکیان بۆ تەیار بووە.

ئاشکرایە بۆ خوێندنەوە و تێڕامان و باش تێگەیشتن و تام و چێژە لێ چەشتنی ئەم شیعرانەش ـ تا ڕادەیەکی زۆر ـ بار و دۆخێکی وا هەر پێویستە؛ دەنا بۆ کەسێکی مەینەت داگرتووی خەم دەورەلێداوی دەرەتان لێ بڕاو و داماو، کوا ئەو دەماخە دەمێنێتەوە لە خۆی بپرسێ و بەنیاز بێ بزانێ: ئاخۆ ئەم گۆزە ئاوی لێ دەخۆمەوە، خاکی لاکی کام خوونکارە؟ یان: ئەو خونچە دەمی کردۆتەوە، گڵی چ خونچەدەمێک بووە؟! منێکی ـ سەعدی شیرازی گوتەنی ـ قەتیس داکەوتوو، خوایە هاوین چ بخۆم و زستان چی لەبەر کەم، چم داوە لەم قسە و باسانە؟

جا ئەگەر لە خوێندن و تێگەیشتن چەند قات سەرتر، باس لە وەرگێڕان بکەین،کورد گوتەنی: «هەر وەتر».

دواى ئەم کورتە تێبینیە، پرسیارێک:

ـ ئەرێ ڕاستی مامۆستا هەژار کەی و چۆن ئەم دوسەت و پەنجا ڕوباعیەی هێنایە سەر زمانی کوردی؟

ـ وردە- وردە و لە نێوان سالەکانی ٦٣ تا ٦٧ی زایینی (٤٢ تا ٤٦ی کۆچی- هەتاوی)؛ یانی لە جەنگەی بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کورد بە ڕێبەری نەمر مەلامستەفا بارزانی، هاوڕێ لەگەل شەڕ فرۆشتن و خەلک کوشتن و بومبا باران کردن و ئاور لە کوردستان بەردانی دەولەتە فاشیستەکانی عیراق لەو سەردەمەدا.

مامۆستا ئەگەر پاش کاری ڕۆژانەی ڕادیۆی شۆرش و ڕۆژنامەی خەبات، ماوەیەکی بۆ مابێتەوە، ڕۆژان لە بنپالێ، سێبەرێ و شەوان لە بەر شۆلەی مۆمێ، چراگڕسۆزێ دانیشتووە و چوارینەیەکی هەلبژاردووە و دەستی داوەتە بە کوردی دەرهێنانی.

کەسێکی بۆخۆی پێشمەرگە و هەر ڕۆژێک لە کێویک، نەزانێ تاوهەلاتی بەیانییەکی تر بە چاو دەبینێ یان هەر ئەوڕۆژە وەبەر یەک لەو دەیان و سەتان فرۆکە سەردان و گوللە و ئاور بارانە دەکەوێ؛ ژن و مندال لە شاری دوژمن، بێ پەنا و بێکەس، بە نهێنی بژین و هەموو ساتێک لەو مەترسییەدا بن دوژمنی قەستەسەری دلڕەق، شوێنیان هەلکا؛ حەوتە و مانگ تێپەڕێ کەس نەبێ خەبەر و باسێکیان لێ بێنێ، دەبێ حال و بالی چۆناوچۆن بێ؟

بەو حالەوە بێننە بەرچاو لە فرسەتێکدا، سووچێکی دۆزیوەتەوە و لێی دانیشتووە و هۆشی لە دنیا بڕیوە و چاوی لێک ناوە و لەبەر خۆیەوە بە نەرمێک ورتەی دێ و جار- جاریش لە سەر پاکەت یان پەڕی جگەرەکەی، بە خەتیکی لار و خوار شتێک دەنووسێ. لەپڕ شریخەی تەیارەیەک؛ ئەمجار گرمە و ئاور و دووکەل و تۆز لە هەموو لایەکەوە بەرز بێتەوە. پێشمەرگەیەک هاوار کا:

ـ مام هەژار! ئەوە چییە ئێژی لە دیوەخان پاڵت داوەتەوە، چاوەڕوانی چای و قلیانی؟ کورە مردووت مرێ، خۆت بکە بە کونە ئەشکەوتێک، بن بەردێکدا؛ کوژرای!

بە سەبرێک لەبەر خۆیەوە:

ـ کاکە دا توخوا تاوێک، نەکا لە بیرم بچێتەوە؛ با بینووسم:

«مەیگێڕ بەسەرت پردی سیڕاتیش کەڵەکە ...»!

مەولانای ڕۆمی دەڵێ: بە ئەوینەوە هەموو شتێ مانای لێ پەیدا دەبێ، کەچی هەموو لە مانای خودی ئەویندا ماونەتەوە! ئەرێ ڕاستی بە بێ ئەوینێکی ئاورین، شتی وا چۆن دەکرێ؟ کوا جێی بڕوایە کەسێک لەو تەنگانەدا، بیری بە لای شیعری خەییامەوە بێ و دڵی هانی بدا بیهێنێتە سەر زمانی کوردی؟! ئەوجار ئەگەریش بۆ دڵی خۆی، کارێکی وای کرد، دەبێ چی لێ شین ببێ؟

با لەم ڕوانگەوە چاوێک لەو شیعرانە بکەین:

١. وەک تایبەتمەندییەکی گرینگ، کێشی چوارینە کوردیەکانیش هەر کێشی «لا حَولَ وَ لا قوَّه الا بالله» یانی ڕوباعین؛ کە جیا لە وەزنی سەرەکی« مَفعولُ/ مَفاعیلُ/ مَفاعیلن/ فَع»، بە یازدە جۆری تریش بڕگەبەندی (تقطیع) دەکرێن و بە بڕوای وێژەوانان، لەگەڵ دژواری و چەتوونیدا، باشترین و سوارترین کێشە بۆ جێکردنەوەی مانا و مەبەستێکی زۆر لە وشە و ڕستەیەکی کەمدا. ئەڵبەت دیارە تاو دانی قەڵەم لەم مەیدانە و هۆنینەوەی شیعر لە سەر ئەم کێشە تایبەتە، کارێکی ئاسایی نییە و وەک ئەسپێکی خۆشبەز بەڵام سەربزێو، شۆڕەسواری خۆی دەوێ.

ئاخۆ بێجگە لەم کتێبە و چەند چوارینەی تر هەر لە هەژار، لە سەر کێشی ڕوباعی، شیعری تری کوردیمان هەبێ؟

٢. ڕاسته شیعره‌کان پاچڤه‌ن و له فارسییه‌وه گیراون، به‌ڵام وا به‌رگه کوردیه‌که‌یان بۆ جوان دوروواوه و وه‌ها وه‌ستایانه ده‌به‌ریان کراوه، فیلم ده‌وێ له‌و هه‌زار به‌یته‌دا، چوار جێم بۆ ده‌ستنیشان بکا شوێنی فارسی پێوه دیار بێ و که‌مووسکه‌یه‌ک فارسییانه بنوێنێ. ته‌نانه‌ت زۆر جاران ده‌سته‌واژه و قسه‌ی نه‌سته‌ق و مه‌ته‌ڵۆکی تۆخی کوردی، به جۆرێ جێ بۆ خۆش بووه و له سه‌ر جێی خۆی دانیشتووه، که‌س له بیری نامێنی خه‌ریکه وه‌رگێڕاوێک ده‌خوێنێته‌وه. بۆ نموونه: «کورد بۆیه ده‌ڵێ له هه‌مزه چی داوه هه‌واس» ، «پێشینه ده‌ڵێن: که‌س به خه‌یاڵ نه‌بووه به ماڵ» ، «تامه‌زرۆ به ماست و دۆشن و نێر دۆشن» ، «تا پیاوی هه‌ژار ده‌گاته به‌غدا، دووره» ، «له شوێن گوڵه‌نه‌ورۆزه، گه‌ڵاڕێزانه» ، «ده‌مبه‌سته‌ی و تۆزاوی وه‌کوو گا گێره» ، «تا تۆش نه‌ڕفێنراوی به‌شت بڕفێنه» ، «هه‌ر دوو گه‌زه خاکی گۆڕ و تۆپێک جاوه» ، «پێوانه هه‌ڵێک به‌تاڵه، زۆرجاری پڕه» ، «په‌رژینی به گوڵ، گوڵ له گوڵم په‌رژینه» ، «هه‌شتێکی له مشته بێنه، نه‌ک نۆ بێ، نه‌بێ» ، «کوا بگره و به‌رده؟ به‌زم و ڕه‌زمت کوانێ؟» و ...

٣. له‌مه‌ڕ تیز و تانه‌ی خه‌ییام له چینی به‌ڕواڵه‌ت ئایینی و ڕخنه له بیری کۆنه‌په‌رستی و لۆمه‌ی تاقمی ڕیش درێژی بیر کورت، مامۆستا هه‌ژار له پێشه‌کیه‌که‌یدا لێی کۆڵیوه‌ته‌وه و جوان- جوان ئه‌م باسه‌ی شی کردۆته‌وه؛ به شێوه‌یه‌ک که خوێنه‌ر هه‌ست ده‌کا قه‌ڵه‌می مامۆستا له‌م باره‌وه هیچ به‌رگر و له‌مپه‌رێکی له به‌رامبه‌ردا نه‌بوه و بیری هیچ گیرێکی نه‌هاتۆته ڕێ و ده‌ستی بۆ نووسینی هیچ ڕاستییه‌ک نه‌له‌رزیوه و ئازادانه ئه‌وی بڕوای بووه، گوتوویه. ئه‌م خاڵه له چوارینه‌کانیشدا دیاره و ته‌نانه‌ت زه‌قتر و به‌رچاوتر خۆ ده‌نوێنێ. بۆ وێنه: «خوێنتاڵی مه‌لا...» ، «ئه‌ی ته‌کیه نشین...» ، «شێخێ به ژنێ خراپی گوت...» ، «بیرت دێ عه‌بای پێوه بوو...» ، «زۆر کۆلکه‌مه‌لا و شێخ...» ، «ده‌روێش وه‌ره...» ، «خوێنتاڵت ئه‌وێ...» و زۆرێکی تریش.

شک لەوەدا نیە ئەگەر مامۆستا هەژار پشتی بە پشتیوانی مەلا مستەفا گەرم نەبوایە، بۆی نەدەلوا ئاوا بە ڕاشکاوی ڕمبی قەڵەمی لێ هەڵکێشێ و وەکوو برینگەرێک بکەوێتە جەستەی گەورەترین بەڵای گیان و لکی لەشی نەخۆشی کۆمەڵمانەوە، لەم چەند چەرخەدا. کەوابوو لەم بارەشەوە ئەم کتێبە خاوەن تایبەتمەندییەکی ئەوتۆیە.[1]

**سەرنجێك لە سەر ئەم چاپە:**

تا ئێستاکە، نزیک بە سەدهەزار بەرگ لەم کتێبە - بە ئاشکرا و بە دزی- لە چاپ دراوە. ساڵی ٦٩ی کۆچی (٩١ز.) مامۆستا فەرمووی با «سرووش» چاپی بکا. لەو کاتەوە تا ئەورۆ، ئەو پەخشانگایە _ لە چەند چاپی جۆراوجۆردا_ دەوری هەشتاهەزار بەرگی لێ چاپ کردووە. ئەوا ماوەیەکە چاپەکانی بە خەتی «نەستەعلیق» و شێوەی «چەلیپا»یە. ئەم شێوە نووسین و شێوازە جوانکارییە، بۆ کوردی بێگانە لە زمان و فەرهەنگی فارس، نامۆیە؛ تا ئەو ڕادە کە چەند برادەرێک لە هەولێر و سلێمانی ڕایانگەیاند کە ئەوانیش وەک زۆرێکی‌تر، لەو کتێبە ناگەن و بۆیان ناخوێنرێتەوە. لە سەرێکی

---

١- خوا لێ خۆشبوو مامۆستا شوکور مستەفا بۆ کاک سەلاحی ئاشتی گێڕاوەتەوە کە مامۆستا هەژار یەکەم جار ڕوباعی «ای صاحب فتوا زتو پرکارتریم ...»ی ئاوا لێ کردووە:

ئەی شێخی تەریقەت! ئەی لە سەر تا پا شین!
بەم ڕیشە بەسم فریو دە! با بیتاشین
من خوێنی ترێ دەمژم و تۆ خوێنی هەژار
تۆ چاوی ژنت! من و تۆ کامەن باشین؟

کە دواجار چەن کەسێک لە دۆستانی _ لەبەر ئەوەی زۆر توندە و وێدەچی لێی قبووڵ نەکەن _ پێی دەگۆڕن و دەیکاتە: «ئەی تەکیە نشین شێخی بەسۆرە و تۆرە ...»

تریشەوە دەزگای «سرووش» ـ بەتایبەت لەم دواییانەدا ـ گوێی بۆ بۆزەپیاو شل نییە و باری خۆی تازە ناگۆڕێ و دەقی خۆی چیتر ناشکێنێ! کە وابوو چار لەوەدایە جارێکی تر ـ ئەمجار لەودیو ـ بە خەت و بەرگێکی وەها لە چاپ بدرێ، بۆ هەمووان بیخوێنرێتەوە.

بە داخەوە لە چاپەکانی پێشوودا، تەرتیبی ئەلف و بێتکەی چوارینەکان تەواو نییە. لەم چاپەدا ئەو کارە جێبەجێ بووە[1]؛ بە شێوەیەک ئەگەر کەسێ تەنیا باڵێ لە چوارینەیەکی لەبیر بێ، بە لە بەر چاو گرتنی ڕیزی ئەلف و بێتکەی زمانی کوردی، دەتوانێ ڕاستەوخۆ بچێتە سەر ئەو یەکە وا بۆی دەگەڕێ. هەروەها لە ئاخری کتێبەکەوە، یەکەم باڵی چوارینەکان بە تەرتیبی پیتە سەرەتاییەکانیان ڕیز کراون تا بەو شێوەش بتوانین بیاندۆزینەوە. زیاد لەمانە ـ بۆ هاسانتر دەستنیشان کردنی چوارینەکان ـ هەرکام ژمارەیەکیان لە سەر نووسراوە.

***

وەک دەزانین، ئەم کتێبە پاشکۆیەکی بە ناوی «چواینەکانی بابا هەژاری موکوریان!» هەیە؛ بریتی لە سی و حەوت دووبەیتی، غەزەلێک (زەردی

---

١ - مامۆستا موجتەبا مینەوی لە کتێبی «پانزده گُفتار»، وتاری «گُلِ سُرخِ نِشابور»دا دەفەرموێ: ڕیز کردنی چوارینەی خەییام بە پێی ڕیزی ئەلف و بێ، کارێکی نەگونجاوە و بە زمانێکی تفت و تاڵ پلار لەوانە دەگرێ وەها کارێک دەکەن! ڕاستەکەی ئەوەیە منی قوتابیش وای تێدەگەم ئەگەر چوارینە کوردیەکانیش بە پێی مانایان تەرتیب بکرێن، تام و چێژەیەکی زیاتر و بگرە تایبەت دەگرنە خۆ؛ بەڵام بە لای خۆمەوە گوتم: با جارێ نوسخەیەکی ئاسایی هێندێک ڕێک و پێکمان هەبێ و ئەو چوارینە بۆی بەنیازین، بە هاسان بدۆزینەوە و بێ دەنگە بیخوێنینەوە، ئەمجا بۆ ئەو کارەش خوا کەریمە.

لیمۆ) و پارچە هەڵبەستێکی چل بەیتی (ڕوانێک)، لە سەر کێشی فولکلوری کوردی، یانی بیست بڕگەی چوار بڕشت.

ئەم پاشکۆیە مامۆستا بۆخۆی دایناوە و ئەگەریش کەسێک پێی وا بێ لە باری هەم کاکڵ و هەم توێکڵەوە، لەگەڵ خەییامەکەدا زۆر یەک ناگرنەوە و جیرانی چاک نین پێکەوە، جێی دەست تێ بردن و هەڵپەرتاوتنی ئێمەمانان نییە. کەوابوو ئەم پاژەش لە کتێبەکە ـ هەر وەکی بەشی سەرەکی ـ ڕیز و تەرتیب و ژمارەیان بۆ کراوە.

دوایین قسە ـ وەک هەمیشە ـ باس لە باری ڕێنووسی کتێبەکەیە. ڕاستە هێشتا ڕێنووسی یەکگرتوومان تەواو پوخت و پاراو نییە و گیر و گرفتمان هەر هەیە و جاروبارەش تەواو تێیدا دادەمێنین. بەڵام هەر ئەمەندەش کە لەسەری پێک هاتوین یەکجار باشە و هەموو نووسەرێک لەسەریە ڕەچاوی بکا و بە موو چییە لێی لا نەدا.

هەر بەو پێیە لەم چاپەدا دەستمان لە پێشوو بەرداوە و ڕێنووسی یەکگرتوومان ڕەچاو کردووە. تا ئەو ڕادەش دەستی داوە، هەڵە و پەڵەکانیمان لێ سڕیوەتەوە؛ بەو هیوایە جێ ڕەزامەندی خوێنەرانی هێژا بێ.

براتان: **ماجد مەردۆخ ڕۆحانی**

سنە، نەورۆزی ١٣٨٧ (٢٠٠٨)

# سەرگوروشتەی ئەم خەییامە

زۆردەمێک بوو دەگەڵ چوارینەکانی خەییامدا ببوومە دۆست؛ ئەوەندەیان هۆگر ببووم، هەرگا کەسم لێ دیار نەبا، بە ویرە ویر فارسییەکانم دەخوێندەوە.

من یەکەمین کەسێک نەبووم کە خەییام بکەم بە کوردی. لە پێش مندا جەلادەت عالی بەدرخان لە ژمارەی ڕۆژنامەی ڕووناهیەکەیدا ـ بە کرمانجی ـ پەخشی دەکرد. شێخ سەلامیش بە شێوەی کوردی هەشت برشت وەریگێڕا و عەلائەدینی سەجادی بۆی لەچاپدا و چەند نمونە تەرجەمەش لە فازیل و مامۆستا گۆرانی دەگەڵخست. ئەحمەدشالیش- کە مامۆستای مەدرەسە بوو- ئەم کارەی بەجێ هێنابوو؛ کە نەمدیوە چاپ کرابێ.

من وێڕای هۆگری زۆرم بە کاکڵی ڕوباعیاتەکەی خەییام، زۆریش حەزم لە وەزنی ڕوباعیەکانی بوو. جار بە جارێک ڕوباعیەکم لە سەر وەزنی فارسییەکە دەکردە کوردی و لای خۆم یاداشتم دەکردن؛ تا ببوونە دوسەت و پەنجا ڕوباعی.

لە سالانی ٤٦ و ٤٧ی زایینیدا- کە کرامە سەرپەرستی چاپەمەنی شۆرشی کورد- بە ئیجازەی سەرۆکی شۆرش (بارزانی) و هاوکارانی، هەر لە چاپخانەکەی خۆمان لە چاپم دا. لەوان سەروبەندانەشدا، ناوی «هەژار» لە لای ساواک قوززەلقورت و ژەهرەمار بوو. هێندێک هەلیان دەڕفەت

زانی و ناوی هەژاریان قت کرد و بەناوی «*خەییام بە کوردی*» ئوفسێتیان کرد و فرۆشتیان. لێرەدا با کورتەباسێکتان بۆ بڵێم:

جارێک لە ناو کۆمەڵێکدا، کاک سەید ڕەشیدی خانەقا گێڕایەوە:

«زەمانی شێخ (مەبەستی شێخی بورهان بوو)، چەند کەس دزێکیان گرتبوو؛ دیواربڕێکیشی پێبوو. هێنایانە خزمەت شێخی. گوتیان قوربان ئەو دزە ئەوشۆ خەریک بوو دزیت لێ‌پکا؛ لە نەخافڵ خۆمان پێدا دا و گرتمان. شەو دەتەویلەمان کرد و ئێستاش ئەوە هێناومانەتە خزمەت تۆ. شێخ هێندێکی تەماشای دزەکە کرد و بزەی‌هاتێ و پاشان فەرمووی: بەرەڵای بکەن با بڕوا! گوتم: قوربان جا چۆن دزێک بەرەڵا بێ و دیواربڕیشی بەشاهید دەگەڵدا بی؟! شێخ ڕووی قسەی کردە جەماعەت و فەرمووی: ئەگەر ئەنگۆ قوون و هونەرێکتان هەیە، لەوە گەڕێن؛ بچن شێخ و خەلیفەکان، قازی و مەلاکانتان بگرن؛ کە زۆر لەو دزە دزترن! ڕدێن و بەرماڵ و عەبا و مێزەر و جبە و قەڵەمیان، ماڵی موسوڵمانان دەبڕێ. ئەنگۆ لەبات بیانگرن، دەچن دەستیان ماچ دەکەن و نووشتە و دوعاو بۆ دەنووسن. چوون ئەو فەقیرەو گرتووە ئاسنۆکێکی دووبستی دەدەستی‌دایە، لێتان کردۆتە شات‌وشووت و دەتانەوێ تەنبێی بکەم؟! ...»

ئێستا دەڵێم جا بەس نەبوو ئەو زەمانی، بێ ویژدانی و ڕاوەڕووتی حەق‌خۆرانی نووسەرانی کوردستان لەناوا نەبو؟ ئەودەم دەبوو چی فەرمووبا؟! ئەوانەی کە ئێستا هەن و بە ڕواڵەتی خزمەت بە وێژە و فەرهەنگی کوردی دەکەن و چاوەچاون لە هەر شوێنێ کتێبێکیان دەداو کەوێ، دەیقاپێنن و بە قاچاغی و بێ پرسی خاوەنەکەیان دووبارە لە چاپی دەدەن و لە سەر بەرگەکەی دەنووسن: «هیچ کەسی‌تر مافی بەسەریەوە نیە»! تا کەی بەرهەڵدا دەبن و تا کوێ دەچن؟ ئەم ئاهۆیە

هەر تایبەتی بە ئێرانە و بەشی زۆریش، کوردستانی گرتۆتەوە. کوردە نەجیمزادەکانی خوێندەواریش، هیچ قوولەیەک لە زیانی‌خرۆیان ناکەن و مالی دزراویان دەسێنن و لایان وایە هیچ زیانێکی بۆ پەز نییە! چەند جارم بەگوێدا داون: ئێوەی خۆ بەپیاو دەزانن، ئەگەر رۆژێک پێ‌بزانن دزێ بە دیواربڕەوە، لە گەڕەکی ئێوە هەیە، گەلەکۆمەکی لێ دەکەن و دەری دەکەن؛ بەلام چۆنە سوور دەزانن ئەم کتێبانە دزین و لێشیان دەکڕن؟! ئێژن ئەمانەش خزمەتێ بە فەرهەنگی کوردی دەکەن! هیچ بیر لەوەش ناکەنەوە کە ئەمانە لە ڕسکان و هەراش بوونی فەرهەنگی کورد، بوونە ڕێگر. لاوێک کە تازە پێدەگا و لە دەردی گەلی تێدەگا و حەول دەدا بە نووسین خزمەتێ بکا ــ با یاساش پاسی بۆببڕێ ــ چۆن دەس بۆ ئەم بڤە درێژ کا؟ خۆ ئەگەر لەجیاتی نووسین توور و گێزەران بفرۆشێ، بەهرەی زۆرتری پێ دەگا. هەرچی بەهرەی قەلەمیەتی بە مەرەدی خەییامەکەی هەژار دەچێ کە تا ئێستا لە سێ لاوە لێی دزراوە و هیچ پرسیشی پێ نەکراوە. بە هومێدم کە ئەم جارە دەتەلەی سرووش هەلنەنگوون و سایە و سەرمایەیان نەڕوا. بەهومێدم خەلک و خوداش تۆزێک هەسیان بدەنەوە و دەست لەو ڕێگریە هەلگرن.

ئیتر ئەوا ئێوە و خەییامەکەی هەژار؛ بۆ پێنجەم جار.

**هەژار**

کەرەج، ڕێبەندانی ١٣٦٨ (١٩٩٠)

هەر تایبەتی بە ئێرانە بەشی زۆریش، کوردستانی گرتۆتەوە. کوردە نەجیمزادەکانی خوێندەواریش، هیچ قووڵەیەک لە زیانیخرۆیان ناکەن و مالی دزراویان دەسێنن و لایان وایە هیچ زیانێکی بۆ پەز نییە! چەند جارم بەگوێدا داون: ئێوەی خۆ بەپیاو دەزانن، ئەگەر رۆژێک پێبزانن دزێ بە دیواربڕەوە، لە گەڕەکی ئێوە هەیە، گەلەکۆمەکی لێ دەکەن و دەری دەکەن؛ بەلام چۆنە سوور دەزانن ئەم کتێبانە دزین و لێشیان دەکڕن؟! ئێژن ئەمانەش خزمەتێ بە فەرهەنگی کوردی دەکەن! هیچ بیر لەوەش ناکەنەوە کە ئەمانە لە ڕسکان و هەراش بوونی فەرهەنگی کورد، بوونە ڕێگر. لاوێک کە تازە پێدەگا و لە دەردی گەلی تێدەگا و حەول دەدا بە نووسین خزمەتێ بکا ــ با یاساش پاسی بۆببڕێ ــ چۆن دەس بۆ ئەم بڤە درێژ کا؟ خۆ ئەگەر لەجیاتی نووسین توور و گێزەران بفرۆشێ، بەهرەی زۆرتری پێ دەگا. هەرچی بەهرەی قەلەمیەتی بە مەرەدی خەییامەکەی هەژار دەچێ کە تا ئێستا لە سێ لاوە لێی دزراوە و هیچ پرسیشی پێ نەکراوە. بە هومێدم کە ئەم جارە دەتەڵەی سرووش هەڵنەنگوون و سایە و سەرمایەیان نەڕوا. بەهومێدم خەلک و خوداش تۆزێک هەسیان بدەنەوە و دەست لەو ڕێگریە هەلگرن.

ئیتر ئەوا ئێوە و خەییامەکەی هەژار؛ بۆ پێنجەم جار.

**هەژار**

کەرەج، ڕێبەندانی ١٣٦٨ (١٩٩٠)

## خەییام و بیر و باوەڕی

ناوی خەییام و ناوبانگی چوارخشتەکیەکانی، لەوە دەرچووە هەژارێکی کورد بە خوێندەوارانی بناسێنێ؛ چونکە ئەو ناو و دەنگە لەو گەڕۆکە سەربەست و ئازادانەیە، بە بێ بەرگر و پرسیار لە هەموو سنوور و کەوشەنێکەوە دەربازبووە و لە سەرانسەری ئەم زەمینە خڕ و پان و بەرینەدا ـبەڕاشکاویـ سەری بە هەمووماڵێکا کردووە و بۆتە ناسیاوی هەموو کەس و هیچ ژیر و بەبیرێک نییە کە ڕاز و نیازی خەییامی نەکردبێتە وەرویرکەی دڵ و خەمڕەوێن و ئاودەنگیلەی هەمیشەی خۆی.

بەڵام نیازم لەم پێشەکییە، دەربڕینی بیر و باوەڕی خۆمە بەرانبەر بەو کابرا خوێنشیرینە و ئەمەوێ لەو سووچەوە کە بەردڵی من کەوتووە، دەمی بۆ بەرم و هێندێک لەو شوێنانە دەستنیشان بکەم کە تاوێستا خەییام ناسەکان و خەییامی نووسەکان بەپێویستیان نەزانیوە، یان لەبیریان نەبووە هەنگاوی بۆ باوێژن!

گەلێک جار و بەزۆر چاپی جۆربەجۆر، چوارخشتەکیەکانی خەییامم بە فارسی و عارەبی دیتوە و هەرجارەش یەک یان چەند مامۆستای بەڕێز، پێشەکی دوور و درێژیان لەسەر نووسیوە و پەڕاوێزیان لێ ناوە و بە خشڵ و جلی جوان خەملاندوویانە و سسڵە و پلپلە و مت‌وموووریان پێوە

هەڵاوەسیووە. تەنانەت کتێبی گەورە و سەربەخۆشم دەربارەی خوێندوتەوە؛ وەک *عمرالخیام*ی ماموستای کوردی، کوردی نەزانی فارسی زمانی عارەبی نووس «ئەحمەد حامید سەڕاف»[1] و دمی *با خیام* لە لایەن ماموستا و نووسەری پایەبەرز، «عەلی دەشتی»[2]یەوە.

زوربەی ئەوانە نیازیان وابووە ئەو شیعرانەی بەناوی خەییامەوە کەوتوونەتە سەر دەم و زاران، دانبڕێر و بەردەشۆری بکەن و ئەوی خۆیان بەردڵیان ئەکەوێ، بیدەنە پاڵ خەییام و ئەوی بە گومانی ئەوان زیوان و داڕووجانە، لێی هەڵوەژێرن و بە سوێندانەوە ڕەش ببنەوە کە: بە ئامان و زامان هەرگیز فڕی بەسەر خەییامەوە نیە؛ چونکە پیاوی وا گەورە، قسەی خۆی ناخواتەوە و دوو دژ لە یەکتر کۆ ناکاتەوە و ئەو زانا خواپەرست و خۆ پارێزە هەرگیز کەپۆی لە شتێکی وا نزیک نەکردۆتەوە کە بۆنی کفر و ناڕەوایی لێ هاتبێ!

بە بیری من ئەوانە لەجیات کاکڵە خۆشەکەی مەبەستی خەییاممان بۆ دەرخەن، هاتوون بە هەڵپەرتاوتن و ڕازاندنەوە -بە خەیاڵی خۆیان- خێچ و خواریان بۆ ڕاست کردۆتەوە و کەم و کووڕیان لێ داپۆشیوە! کەچی، بە داخەوە بەو هەموو شڕ و شاتاڵ و تیتۆڵانە -کە بەدەردی داری چاکییان بردووە- کارێکیان کردووە خوێندەواران سەریان لێ بشێوێ و ئەو بەرە شیرینە نەبینن کە ئەو پیرەدارە شەنگ و تۆرتە، لە پەستا و لە هەموو وەرز و چاخی ساڵا دەیگرێ و دایدەوەرێنێ و بە پلاری بەرد و داری نەزانان و پێلەقەی مێشک وشکان دانایە و ناشکێ و هەرگیز وشک نابێ.

---

١. احمد حامد الصّراف

٢. علي دشتي

ئەگەرچی مێژوونوسان کەم وایە بوێرن یان لە قازانجیان بێ ڕووداوی ڕۆژگاری خۆیان ڕوەوڕاست بنووسن؛ جا یان لە ترسان یان لە برسان، یان بە شوێن ئارەزوی خۆیانا ئەچن! بەڵام دیسان لە تێکخستنەوەی ئەو بوزگوڕانەی کە لێیان بەجێ ئەمێنێ، دەکرێ دیوجامەیەک لێک بدرێ و ڕاوی دەنگ و باسی ئەو سەردەمەی پێ بکرێ.

خەییام لە چەرخی پێنجەمی کۆچیدا ژیاوە. کەسێکی بۆ چۆنیەتی باری ئەو ڕوژگارە، کون و کاژێرێ مێژوو لە کۆنە کتێبە پەڕپووتەکانا بپشکنێ، سەری ڕادەژێنێ و واقی وڕ دەمێنێ. کار و باری دنیا لە دەست مێزەر بەسەر و جببە لە بەر و بیر کورت و ڕیش درێژ و کەللە وشک و داوێن تەڕاندا بووە؛ هەر سازە لە هەوایەک و هەر ئاوازەی لە هەزار جۆرە مێشکی پڕوپووچەوە دەرچووە. حەفتا و دوو تیرە لە ئیسلاما هەبووە؛ هەموو یەکتریان بە کافر زانیوە. هەرتیپەی بە شوێن خەیالاتێکا ئەسپی لینگ داوە و هەر دەستەی لە زەلکاوی نەزانی خۆیا خنکاوە. لە هەر گەڕەکە شار و گوندێکا چەند تەریقەتێک و هەر تەریقەتەی چەند شێخێک و هەر شێخەی چەند سۆفی و دەروێشێک و هەر سۆفیەی ڕۆژووێکی گرتبێ، خۆی بە خاوەنی بەهەشت زانیوە و هەر دەروێشەی دوو حاو و حووی گوتبێ، داوای خوایەتی کردووە.

خەییام هەڵکەوتەیەک بووە کە لە چاخی خۆیدا ئەگەر لە هەموو خەڵکی دەوروبەری خۆی زاناتریش نەبووبێ، لە هەمووان ئازا و بێ ترس‌تر بووە. لەم دەزگا گەورە و گرانە ــکە ناوی زەوین و عاسمانەــ وردبۆتەوە و تێی هەڵڕوانیوە و زانیویە کە ئەم کرداره ڕەنگین و سەنگینە بە بێ وەستا نەکەوتۆتە گەڕ و دانەر و ڕانەرێکی هەر دەبێ هەبێ؛ بەڵام ئەم سازدەرە

شیرینکارە چۆنە و کەی ئەم دەزگایەی بەرهەم هێناوە و بۆچی لێکی داوە و لەو کر و نەخش و تەونە کەونە - کە نە سەری دیارە و نەبن- نیازی چ بووە و لەکەیەوە هەڵیاوەسیوە و کەی لە داری دەکاتەوە و ئەیپێچێتەوە؟ ئەو هەزاران هەزارە ئەستێرە و مانگە پرشنگدارە، بۆ هاتوون و چۆن هاتوون و چیان لێ دێ؟ تیرەی جانەوەر و مرۆ لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ ئەچێ؟ ئەگەر نەهاتایە چ دەبوو؟ ئەگەر هێنراوە، بۆ هەتا سەر نامێنێ و لە ناو ئەبرێ؟ ئەگەر دەمرێ گیانەکەشی دەمرێ یان دەمێنی؟ ئەگەر دەمێنێ جارێکی تریش دێتەوە سەر ئەم زەمینە و ژینەکەی پێشووی دەست پێدەکاتەوە یان دەخرێتە قاپۆڕێکی ترەوە و لە دنیایەکی دیکەوە سەر هەڵدێنێ؟ ئاخۆ کەس هەیە بیزانێ؟ یان ئەو وەرامانە لەپشت پەردەیەکی ڕەش و ئەستوورەوەیە و تا پەردە لا نەدرێ کەس نایزانێ و ئەگەر لاش‌درا، کەس نەماوە تا بیزانێ؟

خۆی لە ناو دەریایەکی سەرگەردانیدا دیتوە و کەوتۆتە پەلەقاژەی خۆ ڕزگار کردن. هانای بردۆتە بەر نووسراوان و دەستەوداوێنی زانا و گەورەپیاوان بووە؛ پرسیویە و خوێندوویەتەوە. کەس نەبووە دەستی بگرێ و لە گێژاوی دەرێنێ و شارەزایەکی وای دەست نەکەوتووە ڕچەی هەواری زانستی ڕاستەقینەی بۆ دەستنیشان کا و لە هەڵدانەوەی پەڕی کتێبان بایەکی وا هەڵی‌نەکردووە تەمی گومان و دوودڵی بڕەوێنێ. ناچار چووەتە ناو بیری بیر و لێکدانەوەی خۆی و زۆر بە وردی، بەراوردی کردووە و ژیرانە لە مێشکا هەڵیسەنگاندووە و ئازانە تێکولی پڕوپووچی شکاندوە و لەمپەری کۆنەپەرستی پەڕاندووە و ئازادانە سەر و بنی کردووە و بڕۆی گەڕاوە.

لەو دەمەوە لێکدانەوەدا گەیشتوتە ئەو قۆناغە کە: تێگەیوە هیچی لێ نازانێ! ئەمەش بەڕاستی پایەیەکی زۆر بەرزە لە زانستدا. سوقرات دەڵێ: من و خەڵکی ئاتینا نەزانین؛ من دەزانم کە نەزانم، بەڵام ئەوان ئەوندە زانا نین کە بزانن نەزانن. ئەم جیاوازییە گەورەیەش ئەبێتە هۆی کوشتنم. یان پێغەمبەری ئیسلام فەرموویە: خوایە وەک پێویستە تۆمان بۆ نەناسرا!

جا چووە لە سەر ئەو جێگە بڵندەوە ئاوڕێکی لەو خەڵکەی دەوروبەری داوەتەوە کە لە تاریکستانی نەزانیدا هەڵوەدان و بە نەشارەزایی، وە نێو قوڕ و چڵپاوی خەیالاتی پڕوپووچ کەوتوون و تێک هەڵدەنگوون و خۆ لێک دەدەن و سەرەنگرێ دەبەن. لاشیان وایە ڕێگە هەر ئەوەیە کە ئەوان گرتوویانەتە بەر و زانست و هونەر هەر ئەو چەقە و گوڕە بنشڕەیە کە ئەوان پێیەوە خەریکن. بەزدی بەوانەدا هاتۆتەوە کە ناوی خۆیان ناوە هۆزان و پیتۆڵی ڕۆژگار و بە عابای فشوفۆڵ و مێزەری لەنگەری و شاڵی سەوز و کەشیدەی زەرد و ڕیشی قەڵەمکار، خۆیان لە بەستەزمانان بە هەیبەت کردووە و مێشک و بیریان لە تێکوڵ و پووچەڵ ئاخنیون و وازیان پێ لە کاکڵ هێناون. ئەم زەویە ناناسن کە لەسەری دەژین؛ کەچی کێشەیانە داخوا عاسمان حەوتن یان نۆ؟!

هەوڕگەر شار بەدەر ئەکەن چونکە کووپەی دەسکردی ئەو، مەی تێکراوە؛ بەڵام کوولەکەسەراوی نابینن کە چەند لووس و لەبار هەڵخراوەتەوە! خۆیان هەزار گزی و دزی و دەسبڕی دەکەن و دەیان ناودتە بینەقاقەی هەژارانەوە، خوێنیان دەمژن و کەلەپووری هەتیو و بێوەژنان ئەدەنە بنلێو و شانازی بەوە دەکەن گۆیا مەی ناخۆنەوە! بە

باسی بادە، بایان ڕەگوێ دەکەوێ و دەهۆڵی گوناهباری بۆ لێدەدەن و لە تۆمەتی کفر ڕزگار ئەبێ.

بەڵێ خەییام گەواهێراتی بیری وردی- کە بەخەڵکی ئەو دەمە قووت نەچووە- دەناو پیاڵەی مەیدا بە گەروویدا کردوون و دڵی خۆی ئاسوودە کردووە و چاوی پیاوی گەوجی بەستووە و گفتە بەنرخەکانی بۆ تێگەیشتوانی دوارۆژ، لەسەر دەم و زاری سەرخۆشانەوە- کەلایان وابووە خەییام هەر بەیارەکەی ئەوانی هەڵگوتووە- دەماودەم هاتووە و بە بێ ترسی چەتە و گۆران، گەیشتۆتە ئەمڕۆ. هەر وەک حافزی شیرازیش و گەلێک لە وریا و ژیران، ئەم وردەکارییە لە خەییامەوە فێربوون و هەر لە سەر شوێنی ئەو ڕۆیشتوون.

## پوختەی مەبەستەکانی

خەییام لەمەڕ هاتوچۆی گیاندار و چلۆنەتی ئەم ئاو و زەوی و بەرز و نەوی و عاسمان و ئەستێرانەوە زانیویە کە هێشتا هیچی لێ نەزانراوە. دیارە هەر شتێکیش کە پیاو تووشی ئەبێ و ئەیبینێ، ئەگەر نەزانێ چییە و چۆنە، ناشزانێ بۆچی ئەبێ و بەهرەی چییە. ویستوویە ئەو نهێنییە گرنگە بزاندرێ و بناسرێ. ئاواتەخواز بووە ڕۆژێک دابێ مرۆ لە سایەی بیرلێکردنەوە و لێکدانەوەی ژیرانە، بە بنج و بناوانی بگا و شتێکی بەکەڵکی لێ هەڵکرێنێ و لەبری ئەوە لەم سروشتە جوانە بترسێ یان جادووی پێ‌بکا، دەستەمۆی بکا و بەهرەی لێ وەربگرێ.

بۆ بیرکردنەوەش، ئەبێ هیچ کۆسپ و بەرگرێک لە ڕێگەدا نەبێ؛ بیرەوەر بتوانێ هەموو هۆشی خۆی -بە خڕوپڕی- بخاتە سەر ئەو نیازە

سیپارە و نووسراوی بەنرخی دەربارەی ژمارە و ئەستێرە ناسین هەبووە و بناغەدانەری سالْپێوی جەلالی بووە و گەلێک شتی‌تریشی لە هەموو بابەتێکەوە زانیوە، هیچ باوەڕ دەکرێ هەمیشە لە سووچی مەیخانەیەکی تاریکا بووبێتە سیپالْ و هەرگیز ئەغیار نەبووبێتەوە؟! ئەگەر مەلیکشا یان خواجە نیزامەلمولک ویستبێتیان چاویان پێ بکەوێ، خەییام لەمەیخانەوە نرابێتە ناو سەبەتەیەک و بە کۆڵی عەنبالێکەوە چووبێ بۆ وەرامدانەوەی پرسیاری پڕ لە گرێ‌پووچکەی دژوار؟

من لام وایە نەیخواردۆتەوە؛ ئەگەر خواردبیشیەتەوە، هەر بۆ ناسین و زانین بووە؛ ویستوویە بزانێ ئەو بادەیە کە وا ئەو هەموو شێخ و مشایخە گەورانە ئەوەندەیان پێ‌هەڵگوتووە، چێژە و تامی چی ئەدا؟ بەلام- وەک گوتمان- خەییام زۆر لەو نەزانانەی کە بەناوی زانا خۆیان بەسەر خەلکا سەپاندووە، تووڕە بووە؛ هێناویە مەیخۆری- کە بێهوشی ئەهێنێ و گوناهێکیە- دەگەلْ زیانی پڕوپووچەکەی ئەوانا بەرانبەری پێ کردووە و ئەلێ: سەرخۆشی لەو هۆشیارییە باشترە کە بەتووڕەهات و پڕوپووچەوە خەریک‌بی. گوناهی مەی لە تاوانی دەستبڕی و درۆ کردن کەمترە. پیاو مەست و بێ‌خەبەر بێ نەک بە ئەغیاری، ئابڕووی دین و زانین بەرێ. لە لایەکی تریشەوە زانیویە لە سەر هێنانی بیر و باوەڕێکی تازە و پێ هەلپرژان و بەگژاچوونی کۆلکە مەلا و گەندەڵە شیخان، لەوانەیە بڕیاری کافربوون و کوشتن و سووتاندنی بدرێ؛ هاتووە ئەو قسە هەق و ڕەقانەی لە تەختی بنی دیزەی شەرابدا شاردۆتەوە و زانیویە مەلا و کال هێندە وریا نین زۆری لێ پکۆڵنەوە و لەناو خلتەی مەیدا بیدۆزنەوە. هەر بە

بزەیەکەوە ئەڵێ: خۆزگە دزی و درۆکردنیش، پیاوی سەرخۆش بکردایە، ئەوسا ئەمانزانی کێ وشیارە!

بە تووڕەییەوە ڕوو لەو جەبریانە ئەکا کە لایان وایە چاکە و خراپە لە دەست مرۆدا نیە و جەهەندەمی و بەهەشتی هەر لە ڕۆژی بناوانەوە ناونووس کراون. ئەڵێ کە وایە سەرکۆنەی مەستێک بۆ ئەکەن لە سەر مەیپەرستی؟ گاڵتە بەو کابرایە دەکا کە لای وابووە گیانی پیاو ڕائەگوێزرێ و لە پاش مەرگی ئەچێتە بەر جانەوەرانەوە؛ ئەڵێ کە وابێ هەڵدەگرێ ئەو کەرەی لمی پێ ئەکێشن وەک تۆ مامۆستای چەققەخانەیەک بووبێ!

خەییام هیچ باوەڕی نەکردووە زەمین لەسەر پشتی گایەک بێ و بەسمکۆڵی کەری جرجاڵ لەبەریەک بچێ و تەمەنیشی پێنج یان شەش هەزار ساڵانە بێ. ئەو هێندەی بە لەمێژینە زانیوە لای وابوە هەر خاکێکی هەیە، پاشماوەی لاشەی مردوانە. لاشی وا نەبووە ئەم دەزگا گەورە و گرانە وا بە سووک و هاسانی و بەو زوانە تێک ئەچێ. جا ناچارە بڵێ: لە نێوان گای زەمین و گای عاسماندا، کەرەگەل دەژێ!

بە کوردی و بە کورتی، ئەو گفتانەی خەییام- کە بەرواڵەت دژی یەکتر دێنەوە- هەر یەک وەرامێکی گرچووبڕە بۆ باوەڕێکی پڕ لە هەڵەی ئەو ڕۆژگارە. هەر لەدەمی خاوەنیانەوە وەریگرتووە و هەر بەویش دەمکوتی کردوون.

## خەییام و مەی

ئەڵێ! خەییامێک کە خاوەنی ئەو هەموو بیرە قووڵ و بەرزانە بێ، یان وەک مێژوو پێمان ئەڵێ، مامۆستایەکی گەورە و هۆزان بوە و گەلێک

کە هەیەتی. زەندەق نەماو و تۆقاوێکی هەر لەسەر پشتی لاتکەوە، تا دەچێتە ژێر تویی خاکەوە، هەر بە داغ و ئاگر بترسێنرێ و مار و دووپشکی سەرپان و کلکدرێژ لە خوێن و مێشکیدا تریتانە بکەن، فێر کرابێ کە شەو و ڕۆژ و مانگ و ساڵ هەر ئەبێ بگری و خۆی بە تاوانکار دابنێ، هەلی بیر کردنەوەی ژیرانەی چۆن بۆ ئەمێنێ و چۆن دەرفەت دێنێ زانستی پڕ سوود و بەهرە بخوێنێ؟

ویستوویە بزانین ئەو کۆلکە مەلایەی کە نازانێ بۆخۆی لە کوێڕا هاتووە و بۆ کوێ دەچێ، سیایی جەهەندەمیشی نەخراوەتە بەردەم تا بزانێ کێ لە ئاگرا کورسی بۆ دانراوە و کێش سێوی بەهەشتی بۆ قاش کراوە!

خەییام خوای ناسیوە؛ بەلام وەک خواناسە گەورەکان. لای وا بووە خوا هەمووی هەر خۆشی و بەزەیی و جوانی و بێنیازییە. هەرگیز نە چاوی لە نوێژ و ڕۆژووی کەسە و نە وازیشی لە تۆلەساندن و گۆشت برژاندن و کەلاک هەلواسین و ڕشتنی فرمێسک و خوێنە. ئەوانەی خوایان وەک جەندرمەیەکی تورک دێتە بەرچاو، نەیانناسیوە و بە هەلەدا چوون. خواش بۆخۆی فەرموویە: من وەک هیچ شتێک نیم.

## خەییام بیر و باوەڕ

خەییام کوڕی کێ بووە و چەندساڵ ژیاوە و چی دەبەردابووە و چ جۆرە پێخۆریکی خواردووە و بە کام نەخۆشی مردووە، کەیفی خۆیەتی. مەبەستی گرینگ ئەمەیە چەند بیر و باوەڕێکی تازە و ترووسکەدار لە ڕۆژگارێکی کۆن و ئەنگوست لە چاوا لە کابرایەکی ژیر و وریاوە سەری هەلداوە و ڕچەی ئازانی و ئازادی بۆ شکاندووین و دنەی داوین کە خۆمان

بناسین و بوێرین بیر لە ژیان و چارەنووسی خۆمان و دەور و بەرمان بکەینەوە. هەر گوتراو و نووسراوێکی لە دەور و بەری ئەم مەبەستەدا ئەگەڕێ، خەییامییە و شانازی بۆ خەییامە. جا با لە دوای خەییامیش کەسانێکی وا بووبن باوەڕیان بە خەییام هێنابێ و نەیانوێرابێ ناوی خۆیان دەرخەن و کۆرپەی نازەنینی خۆیان بە ناوی مامۆستاوە ناوکبڕیبێ، یان نانی خۆیان لە سەر خوانی خەییام خواردبێ. کە وابوو ئەگەر گوتیان خەییام هەر پەنجا چوارخشتەکی هەبووە، یان بڵێن خو لە هەزاریش دەدا، زۆر جیاوازی نیە؛ هەر ئەوە مەرجە لە نیاز و مەبەستا یەکتر بگرنەوە.

سا منیش بەو پێودانە هاتووم دووسەد و پەنجا چوارینی خەییامم لەسەر کێشی ماکە فارسیەکە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی. نەشمویستووە فارسی فێری کورد بکەم؛ واتا: وشە بە وشە و بەند بە بەندم نەگۆڕیوە؛ تەنیا بیر و بڕوای خەییامم بەکەسم و بیچمێکی کوردانەوە خستۆتە بەرچاوی هاو زمانانم. جا ئەگەر چاک بن یان چرووک بن، هەر ئەوەندەم لە دەست هاتووە و هەرکەسیش هەڵەم بۆ ڕاست کاتەوە و پەڵەم بۆ هەڵگرێ و شڕەم بۆ پینە بکا، سوپاسی ئەکەم.

**هەژار**

هاوینی ١٣٥١(١٩٧٢)

# ناوەرۆك

## ١

بێهوودەیە بیر و خەم، دڵت خۆش‌کە بـرا

پرسیار نـەکرا، بەشـت درا هـەرچی درا

تۆ هێشتە نەهاتوویە جیهان، ڕۆژی بەرێ

ئەو ڕۆژی دەبوو بچیە دەرێ، دیاری کرا

## ٢

مردن چیە؟ کەس تێ نەگەیی تا وێستا

تەوراتـ و زەبوور، تا دەگەیـە ئاوێستا

زۆر کـەس لـە ژیـان دواوە زانایانـە

بۆ باسی مەرگ گێل و نەزان ڕاوێستا[١]



١. ئەم دوو چوارینە لەبەر مانایان، پێش و پاش خراون.

٣

بیستوومە بەهەشتێ هەیە حۆری تێدا

ڕووبـــاری شـــەرابی پـــاکی دەڕوا پێـــدا

من لێرە مەی و یارێ پەیا کەم چ دەبـێ؟

دەسکەوتەکە هەر یەکن بە هەردووک ڕێـدا

٤

بەس هەڵبخولێ بـە دەوری پـیس و پاکـا

تا کەنگێ بە شوێن هەموو خراپ و چاکا

گەر زەمزەمی، یـان دایبنـێ ئـاوی ژیـانی

ناچاری دەبێ ڕۆچی بـە سینەی خاکـا

٥

ئەو ڕۆژە خودا سانی گیانی ڕانا

دەیزانی بە کردەوەم، خودایە و زانا

هەر خۆیەتی دایناوە هەڵە و سەرپێچیم

سووتانی جەهەندەمی لەبەرچی دانا!؟

٦

تیرێژ کە بە ڕۆژ و پێل بە دەریا دریا

لەو ڕۆژەوە گوڵ پێکەنی، بولبول گریا

خوا نووسی لە چارەی ڕەشی ئێمەش بەشمان

ژینێکی هەژاری پڕ لە خۆزیا و بریا

٧

گریا گوڵـێ بـۆ گـوڵاو سـەر ئـاگر نریـا

ئـەم بـۆن و بەرامەیـەم نـەبووبا بریـا

نرخی هونـەر و جوانیـیە دەیبا گـەردوون

کێ پێکەنی جارێکی، هەزار جار گریـا

٨

لەو کۆشک و سەرایەدا کە جەم جـامی گـرت

ڕێـوی ترەکیـوە، مـامز ئـارامی گـرت

بارام کە هەموو ژیانی خۆی گـۆڕی دەگـرت

دیتت بە چ جۆرێ گـۆڕێ بـارامی گـرت؟!

٩

گویا لە جەهەنـدەمن ئەویندار و مەسـت

بەم واتەیە پێکەنیم و گوستی خـۆم گەسـت

جێی چەند کەری کولکنە ئەگەر وابێ بەهەشت

یان چۆڵ و بیابان و کپە وەک لەپی دەسـت

١٠

ڕێم کەوتە گولستانەوە لای بولبـولی مەسـت

بە چریکەیێ پێی گوتم گـەلێ ڕاز و مەبەسـت

تا گوڵ نـەوەریوە تـا لەشـت نـەبووە بـەگڵ

وەک گوڵ بە دەمێ، دەم بە بزە و پیاڵە بە دەست

١١

گێژی لەخەیاڵات و گلەی بەختی ڕەشت

رابوێرە هەتا بەجارێ نەبڕاوە بەشت

دەس بگرە بە بەندی سەر و پرچی جوانێک

تا هەڵنەوەشێنراوە هەموو بەندی لەشت

١٢

مەیگێڕ دە وەرە بەخێری چاوی کاڵت

دڵ تینووە جەرگم ڕەشە چەشنی خاڵت

وا تۆبە بەسەریەکا شکا وەک پرچت

بۆم تێکە مەیەک لەڕەنگی کوڵمی ئاڵت

١٣

...یرت دێ عەبای پێوەبوو جێباری لمت؟

ئەو بیری لە دەریای پڕوپووچا نوقمت

ڕیشت لەدواوە هاتەدەر بوو بە کلک

نینۆکی دەس و پێت خڕوپڕ بوونە سمت

١٤

ئەی شووشە بنازم بە دڵی خاوێنت

تاوم بدەرێ بە ئاوی خەم تاوێنت

دەستم بەر ئەدەم لە ئارەزووی دوور و درێژ

مەیگێڕ لەوەلا دەستی من و داوێنت

## ١٥

هاتوومه جیهان چم به چ کرد؟ تێگەی: هیچ

هەر بنج و بنـاوانی جیهـان دەرخـەی: هـیچ

ڕووناکی دەرم، شەمم کە فووم لێ کەی: هیچ

نەینووکی دەسی جەمم لە بەردم دەی: هیچ!

## ١٦

باش ڕێگە ئەچووم یـاخۆ گـلابم ڕابـرد

گەر دوورەپەرێز بووم و تـەبا بم ڕابـرد

ترسم هەیە بۆم بێتە ژمـار ڕۆژی ژمـار

ئەو ژینە کـە بـێ‌یـار و شـەرابم ڕابـرد

١٧

ڕۆژگاریٚ مرۆ تیا ژیابوو ڕابرد

ئاویٚ بوو بە جۆدا چووە، با بوو ڕابرد

هەرگیز مەڵیٚ وابوو واچوو خۆش نایەتەوە

گەر تاڵ و زەبوون ژیاوی چابوو ڕابرد

١٨

ئەو خوایە کە گەردوون و زەوی بەرپا کرد

ئەو ڕۆژە مەکۆی دەرد و خەمی پەیدا کرد

وەک ڕژد و چنۆک هەرچی بەنرخ و جوانە

هێنای بە پەلە و گورجیٚ دەخاکی ڕاکرد

١٩

ئەم گۆزە وەکوو من بووە: دڵدار و هەژار

جارێکی دڵی خۆش بووە سەد جار خـەمبار

ئەو هەنگڵ و دەسگرەی لـە ملیـا دیوتـە

دەسـتێ بـووە زۆر خراوەتـە سـەرملی یـار

٢٠

بەس گێژبە لە ناو پێنج و شەش و حەوت و چوار

مەی فڕ کە دەتاوێیتـەوە وەک بـەفری پـار

نـەتزانی لــە کوێــوە هــاتگی ڕۆژی بــەرێ

ناشـزانی بەرەوکوێیـە بـەری پاشـە هـەوار

## ٢١

سەرخۆش بە بە مەی، لە سەر دەراوێژە کەسەر

ئەم کورتە ژیانە ڕێی خەمانی مەخـە بـەر

بەس گێژ و نەزان و هێڕ بە! خۆ تـۆ زێـڕ نی

ژێر خاک بکرێی، دووبارە بتهێننـەوە دەر

## ٢٢

پەندێکی منداڵەکەت بدە مامـەی پـیر

با بازی بە خاک و گڵ نەکا، ژیری بەبیر

بێژنگی لەدەس دەرێنە بەس دابێـژێ

کەللەی سەری پاتشـاه و مـیر و وەزیـر

٢٣

لەش ناسک و لاوچاکی وەها هەن کچ و کوڕ

گوڵ دڕکە بەرانبەری بکەی، بێکەسە دوڕ

گەردوون کە بەدانستە دەیانکا، وەک شێت

تێکیان هەڵئەشێلێت و دەیانکاتەوە قوڕ

٢٤

تاکەنگێ خەریکی پێنج و چواران مەیگێڕ

دڵخۆشی بدە بە کۆڕی یاران مەیگێڕ

ژین کورتە ئەوەی نایەنێ خەم دابگرین

بۆم تێکە بە یادی چاوخوماران مەیگێڕ

٢٥

خو لا مەدە دەی بادەکە با بێ مەیگێڕ

بەرماڵ و جبەت گرەو لە لا بێ مەیگێڕ

گوێ بگرە لە من هەرچی مەلا و شێخ گوتیان

دەگوێی مەگرە! لات وەکوو با بێ مەیگێڕ

٢٦

جارێکی بە مەستی عەرەبێکی پێخواس

نەیزانی لە لۆکی هەمزە ڕاساوە بە داس

مەی بۆیە حەرام کراوە، سا سەیری کەن

کورد بۆیە دەڵێ لە هەمزە چی داوە هەباس؟!

٢٧

ئـای خۆزگـە ببایـە جێگـە بـۆ سـانەوەیەک

لەم ڕێگەیە دوورە سوور و پێچدانەوەیەک

سەد خۆزگە لە پاش نەمان وەکوو سەوزە گیا

بکرایە لە گـڵ هومێـدی هەڵـدانەوەیەک

٢٨

بۆ گۆزەکـڕین دەچوومـە لای گـۆزەکـەرێک

سەد گۆزە بەمن پێکەنی هەریـەک لەبـەرێک

ئێمەی وەکوو خۆت ئەبەی سبەینێ خۆشـت

وەک ئێمە دەبی بـەگۆزە لای بـێخەبـەرێک

٢٩

ڕابویرە بە سەربەرزی بە نـان و ئاوێـک

سەر دامەنەوێنە بـۆ هـەموو ناپیاوێـک

لەم ژینە کە هەر دەمێکە دێت و دەڕوا

مەردایەتی مەفرۆشە لە پێنـاو تاوێـک

٣٠

ئەو بەسیە بەیانە هەستە چاو کاڵی شـەپاڵ

گفتێکی شیرین بکە مـەزەی بـادەی تـاڵ

کــاروانی ژیــان دەئــاژوێ ڕوو بــە نــەمان

هاکا من و تۆش دەبینەوە خەون و خەیاڵ

## ٣١

ئـەم ژینــە کــە ڕابــرێ، چ شــیرین و چ تــاڵ

تووش‌بی بە مەرگ، چ دەربەدەر بی چ لەماڵ

بێخەم بژی! خوش‌بە! پاشی مەرگی من و تۆش

بێ‌پسانەوە دێــن ڕۆژ و شــەو و مانــگ و ســاڵ

## ٣٢

بۆ بیری بەهەشت و ئاگرێ کەوتیە چــاڵ

خۆشــتر لەخەیاڵــی شــیرنە بــادەی تــاڵ

بەس ترس و هومێدی بێ‌نیشان و بەڵگە

پێشینە دەڵێن: کەس بەخەیاڵ نەبووە بــەماڵ

٣٣

ئەو ڕۆژە کە مـردووم و لـە دنیـا نـابم

ئەوکاتە کە لەش تۆز و گڵـی بـەربا بم

خـاکم بکەنـە گۆزەڵـە، بـۆ مەیخانـە

تامل پـڕی مـەی بکـەن لەوانـەم ڕابم

٣٤

لەم بێخەبەری خۆمـە کەسـاس و مـاتم

بێهوودە دەبووڕێ دەم و سات و کاتم

من ببم و نەبم جیهان وەکوو خۆی وایـە

مەیگێڕ وەرە لێکیدەوە من بۆ هاتم؟

## ٣٥

مەیگێڕ بە دووچاوە مەستەکانت مەستم
تۆم لابی لە دووجیهان بە چی دەربەستم
هاواری لەپیری دەستگیرە دەروێش
من پیرم و تۆم دەوێ کە بگری دەستم

## ٣٦

گیراوە قوڕم خرامە قالب، خشتم
با دراوی یەکێ ترم کە خاوم، گشتم
چاتر لەوە بم کە هەم لە دەستم نایە
خوا ڕۆژی بەرێ بەو کلە چاوی ڕشتم

٣٧

مەیگێڕ بگە پێم لە بێ مەیی مـاڕووتم

تووڕم بدە کووپەوە لە دووریـت سـووتم

تووڕم لە پەنا ڕەزان بکۆڵـن! ڕەزەوان،

هەڵبەستێ لە پەلک و داری مێو تابووتم

٣٨

مەیخانە پەرست نەبووم و تووشت کـردم

بەو پیریە بەرەوپیری ئـەوینت بـردم

ڕووبـینی کـە لـێڵاوە تکـا، تۆبـە شـکا

دینداری کە ڕەنگاوی ڕیا بوو شـردم

## ٣٩

دڵداری چ یارە؟ فێرە سەودای کـردم

بڕوانە لـە چـاوی سـوور و ڕەنگـی زەردم

نرخـی بزەیـەک بـارە لەسـەر لێـوانم

پارسەنگە دڵی گەرم و هەناسەی سـەردم

## ٤٠

جار- جارە پـەنا بـە مـەی دەبـەم، ناچـارم

خـەمبارم و پـێم ئەڵـێن کـە تاوانبـارم

خۆزی وەکوو مەی درۆ و دزیش مەستی ئەکرد

مـەردێکم ئەویسـت کـە بیگوتـا وشـیارم

٤١

داوه له كفر و چم لەدین؟ من ژیرم

مەیخانە و مەیفرۆشە تەكیە و پیرم

ارەت چیە؟ پرسیم له جیهان، كەیفە گوتی

ڕووخۆشی هەواڵی تۆم و زویری، زویرم

٤٢

ۆژ گەورەیە، چۆن بە تۆپە قوڕ وەیشێرم

زانام بەگەلێ نهێنی، خۆ دەبوێرم

زۆر پڕ لە گەواهیراتە دەریای بیرم

دەرخستن و شاندانی بە كەس ناوێرم

٤٣

مەیگێڕ وەرە بەرماڵ و جبەی دەفرۆشم

ڕیشم لە گرێو دەنێم و شەی دەفرۆشم

تەزبیحی دەسم کە داوی فێڵبازانە

هەرکەس دەیەوێ بە چۆڕێ مەی دەفرۆشم

٤٤

مەیگێڕ وەرە مەی ئاڵ بدە با بینۆشم

شەشدانگی بەهەشت بە شووشەیەک دەفرۆشم

فەرمووتە لەپاش مەرگ بەرەو کوێ دەمبەن؟

سەرخۆش کە دەڕۆم کێوە بچم دڵخۆشم

٤٥

دەسـکاری خودایــە خــۆم و ئاکاریشــم

بۆ هەرچی دەچم لەدەستی ئەودا ڕیشم

هیچ کارێ بەدەس خۆم نیە هەرچی دەیکەم

ئەو پێمــی دەکـا، هێشــتە گوناباریشــم!

٤٦

پاک هاتمە سەر زەوی و دەڕۆم، ناپاکم

خۆشیم کە نەدی هەمیشە بۆی خەمناکم

سوێراوی چەمم کڵـی دڵـی نـێڵ داوم

ژیانیشــە بــە بـادا چــووە تــۆزێ خــاکم

٤٧

چاومەستە دە هەستە بێرەلام خونچە گوڵـم

ماچم دەیە بمدوێنـە مەشـکێنە دڵـم

لـەم دەفـری مەیـەت کاسـەیەکم بـۆ تێکـە

تا نەبووە بە دەفر و کاسە و گۆزە گڵم

٤٨

مەڕوانە پەشـێو و لێـو بـەبارم، نـە کـەمم

بەرزم لە هـەژاریـا چیـای سـەر بـە تـەمم

هەرکـەس لـە سـەرێکەوە خـودا پێـداوە

من خاوەنی شـەشدانگی کوڵ و دەرد و خەمم

٤٩

هەرچەندی بلێی بە بەژن و باڵا جـوانم

ڕوومەت گوڵ و چاو کەژاڵ و لێو قەیتانم

وەستایێ کە وای لە خاک و گڵ داڕژتم

نیازی لەمە چیبوو؟ بۆچی کرد؟ نـایزانم

٥٠

ئەم پیاڵە وتی کـە هاتـە سـەر لێـوانم

شابووم و گەلێ وەک تۆ لە ژێر فەرمانم

لە خوارنەوەما دەفر و پیاڵەم زێڕ بـوون

وا ئێستە پیاڵەم و بـە سـەر خۆشـانم!

٥١

هاتن بە دەسی خۆم نـەبوو، هێنایـانم

دەرچوونەدەریش چۆن و کەیە؟ نازانم

سەد خۆزگە نەهاتبام، نەچووبام، نەببام

لەم گێرە و کێشەدا ڕەحەت با گیـانم

٥٢

بـە خوێندنـەوە کـراوە فرچـک گیـانم

زانســـتە مــژیم و بۆتــە ئــاو و نــانم

حەفتا و دووساڵە بیر دەکەم، دەخوێنم

وا تــازە دەزانم چ لــە هــیچ نــازانم!

٥٣

گیانی منە مەی کە بێ ئەوم، بێ گیانم

ژانم لـــە دڵایـــە بادەیـــە دەرمـــانم

هەر ئەو دەمە لام خۆشە کە مەیگێڕ بێـژێ

هەر دوو فڕی دی، بڵێم بەسـە و نـاتوانم

٥٤

بۆ هاتمە سەرزەوی و لەبەرچی چـوونم؟

بەهرەی چ بوو بۆ خودا نـەبوون و بـوونم؟

هاتووم و دەچـم بـێ وە بـزانم بـۆچی؟!

پـاس مردنەکــەش دوورە دەزاوی ڕوونم

٥٥

مەی کووپەیەک و گۆشت و مەزە و نانی گەنم

جوانێ بەتەنێ لـە چیمـەنێ بێتـە کـنم

ماچی دەمی مـەی‌نۆشـی لـە سەرخۆشـیدا

وەبزانە کە مەزن و میری ئەو ناوە مـنم

٥٦

چاوجوان دە مەڕۆ تێری دلـم بتبیـنم

گوڵ چین کە لە سەر ڕوومەتی تۆ گوڵچینم

داخم کە هەبێ لە گێژەڵووکەی مەرگە

وەک پەلکەگوڵــێ هەڵــدەوەرێنێ ژیــنم

٥٧

خوزگە لە مردنا بە مــەی شـۆراوم

ژێــر ســێبەری مەیخانەیــەکا نێــژراوم

ن ڕۆژی قیامەتێ منی دێتــەوە بــیر

هیچ بۆم نەگەڕێ، لە چۆمی مەی خنکاوم

٥٨

بینی کە خــەمبار و کــز و دامــاوم

وا بیر مەکەوە لە مەرگ و کەس ترسـاوم

مردن کە لە ڕێمە، هەر دەبێ، ناترســم

ژاکــاوی ئــەوەم بــە ئــارەزووی نــەژیاوم

٥٩

گۆزێک لەدەسم شکابوو، ئەو گریا بۆم

خەم داتنەگرێ منیش یەکێکی وەک تۆم

زۆرجاری منیش وەکوو تۆ گۆزەم دەشکاند

تۆش ڕۆژێ دەبی بەگۆزە دەشکێی وەک خۆم

٦٠

هێشتا لە بەهەشتا دەگەڕا بابادەم

لەو ڕۆژەوە من هۆگر و مەستی بادەم

ئەو تڵتە کە پیری مەیفرۆش دەیرێژێ

تۆزێکی بە زێڕ و گەنجی قارون نادەم

٦١

سەرکۆنەکەران دەڵێن کە مەستی بادەم

من گوێچکە بەوان تەوس و توانجان نادەم

سەرخۆشـم و مەیخانەپەرسـتم بـۆچی؟

هەر بۆیە کـە خـۆ لـە خۆپەرسـتی لادەم

٦٢

خوا داوی ئـەناوە داوی ئـەو بـا نـادەم

دەعبایەکی گرت و نـاوی لـێ نـا ئـادەم

ڕاوی ئەوە، داوی ئەوە، دانەش هی ئەو

دەمخاتە تەڵە و گەرەکیە خۆشم لادەم!

٦٣

کاروانە ژیان، گەرەک بە لەز بم، ڕاکەم

میوانی شەوی درێژی ئەم ژێرخاکەم

گیانم دەرئەچوو، وتم وچانێک، فەرمووی

دیواری لەشت شکستە چۆن بارناکەم

٦٤

با هەستم و چاومەست و مەیێکی جوور کەم

بەس زەردی خەمان بم و بەمەی ڕووسوور کەم

لاوێچێ بەڕووی هۆشی بزۆزمدا دەم

با تاوێ لە خەو ڕاچێ لە خۆمی دوور کەم

٦٥

ئەم جارە پەلاسی شەرم و دین پارە دەکەم

ئەم دەردی هەژاریەم بە مەی چارە دەکەم

سێبەردە دەنێمە مستی بیری پیرم

کیژی ڕەزی ڕووسووری ترێ مارە دەکەم

٦٦

کوا مەی؟ بڕەوێ خەم و خەیاڵ و خەوەکەم

وا ڕوو بە مەرگ گلۆر. ئەبێ ڕەوڕەوەکەم

ئەوخشتی لە خاکی لەشی من دەیپێژن

نێزیکە بچێتە چینی خانووی نەوەکەم

٦٧

هات و چوو بە بێهوودە منالی و جـوانیم

پیر بووم و بە بێ داخەکـەم و خۆزیـا نـیم

شاگردی زەمانە بووم و زۆریش چەوسـام

وەستام لە هەموو کار و لە هیچ وەستا نیم

٦٨

مەیگێڕ وەرە لام چ دەربەسی بـەدناویم؟

پاراوکە دڵم سیس و کزی بـێئـاویم

مەڕوانە کە پیرم، دەمێ سەرخۆشم کەی

پێم وایە شل و شەنگە نەمامی لاویم

٦٩

زۆر كۆلكە مەلا و شیخ هەیە ڕێ دەگرن لێم

لایان هەڵەیە لە ژیـنی خۆشـم بدوێم

خزمینـــه! نـــەزانین چ بـــەلایێکی زلـــه

هاتوومە جیهان دەبێ نەزانم من کێم!

٧٠

داخم ئەوی دێر هات و ئەوی کەوناران

هاوباوەشی مەرگن و لـە دنیـا تـاران

کەس نایەتەوە بەرەو ژیان لێـی پرسـم

لە کوێیە بنە و باری هەواری یـاران؟

٧١

هۆ مامی هەورِگەرا بەسە هەڵـکەی دامـان

ئەو خەڵکە بە تۆ پێدەکەنن، تێت ڕامان

هەر لاشی هەژارە و سەری شا و خوونکارە

سووری دەدەی و دەیکەیە دەفر و ئامان

٧٢

گەردوون لە سەریدایە خەیاڵێ بۆمـان

هەروا دەگەڕێ بکۆڵـێ چاڵـێ بۆمـان

ئاڵـە و شـەوە بیبـا، چ دەکـا بـا بیکـا

مەیگێڕ شەوی خۆشە تێکە ئاڵێ بۆمان

٧٣

کێ تا سبە دڵنیایە بۆ مان و نەمان

ئەی مانگە وەرە لە دڵ دەراوێژە خەمان

خۆش مانگەشەوە، هەڵی مەیە و مەی بێنە

تاتیشکی نەداوە مانگ لە گۆڕخانەکەمان

٧٤

خوا دەردی کە داناوە دەواشی دانان

مەیخانە بەرانبەرن بە دەروێشدانان

گەر بادە نەبایە لەم جیهانەی پڕخەم

تاوێک نەدەمان ئەوانی زانا و دانان

٧٥

هەڵسە بەسە پیش‌خواردن و مل کز کردن

مەی تێکە بخۆین لە باتی خەم بۆ مردن

ئاکاری جیهان ئەگەر وەفای تێدا با

نۆرەت نەدەهات لەوانی زوو ڕابردن

٧٦

ئەستێرە هەمووی ئەگەر درشت و وردن

ئاوان و دەڕۆن و دێنەوە و لێک گردن

لەبڕانەوە نایە هات‌وچۆی چوون و بوون

تا خوا هەیە هەر دەمێنێ زان و مردن

٧٧

لە نوێنی گوڵا پەکوو کە نوستوو زۆرن

بەربیر و خەیاڵ کەمن، لەبیرچوو زۆرن

هەرچەندی کە دەڕوانمە بیابانی نەبوون

سەد هێندی ئەوانی چوون نەهاتوو زۆرن

٧٨

هێندێک بە خەیاڵ لە دین و ئایین ژیرن

لایەک بە گومان لە بێگومانی گیرن

ساییری دەبێ تێبگەن کە هیچ تێنەگەیین

کەمتر لەسەری پیاز و پەلکی سیرن!

٧٩

مـانگی ڕەمـەزان نزیکـە پێمـان ئێـژن

مەی هەرچی هەیە بڕێژن و مەیچێژن

من هێندە ئەخۆمەوە لە کلکـەی شـابان

مەست و کەلەلا بۆی دەکەوم تا جێژن

٨٠

زۆر کەس هەیە هەر دەوێژن و ناپێژن

ئەو ئێمە بـەگێژ دەزانـن و خۆیـان گێـژن

گۆیا ئەوی کووپە مەی ئەکا دینی نیـە

بۆ ئەو کەسی کوولەکەی دەکا چیئێژن؟!

## ٨١

گۆڕخانە نشینان کە لە بن سەرپۆشن

خۆڕایی نیە وەها کپ و خامۆشن

ئەی خوایە لەکام بادەیە دەرخواردت‌دان؟

بێهۆشن و بۆ هەتا- هەتا سەرخۆشن

## ٨٢

گۆڕهەڵکەنی من لە هیچ و پووچ دڵخۆشن

خشتی گڵی کۆنە مردووان دەفرۆشن

ڕۆژیش دێ گڵی من و ئەوان بکرێ بەخشت

تا گۆڕی هەزارێ تری پێ داپۆشن

٨٣

پیاوانێ بە ژیری و هونەران دڵخۆشن
تامەزرۆ بە ماست و دۆشن و نێر دۆشن
وا باشە ئەگەر دەکرێ نەزان و گێل بن
کەس گێژەڕ و تووریش بە هونەر نافرۆشن

٨٤

چ کراوە بەرێ؟ نە تۆ هەڵیدێنی نە من
لەو بارە بەڕاست نە تۆی کە دەخوێنی نە من
چی بۆی ئەگەڕێین لە پشتی پەردەیکەوەیە
گەر پەردە نەما نە تۆی کە دەنوێنی نە من

٨٥

ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ لە عاسمانانن

هۆی گێچەڵ و مشتومڕی زانایانن

چین و چ دەکەن؟ کێوە دەچن؟ چۆن هاتن؟

خۆشیان وەکوومن نەزان و سەرگەردانن

٨٦

پێک نایە هەتا سەر لە جیهانا گیر بوون

زۆر شێتیە بێ بادە بژیم سیس و زەبوون

دەس بەردە لەکۆن و تازە و ترس و هومێد

دنیا -کە نەمام- تازەیە یان کۆنە بە توون

٨٧

داخـم گـەلێ یـار و خۆشەویسـتان مـردوون

لـەش خـاکی نێـوان کۆمەڵـێ دار و پـەردوون

چەشتمان لە مەیەک هەموو لە ناو کۆڕی ژیان

پێش ئێمە بە دوو- سێ پشوو مەستی کـردوون

٨٨

بەهرەی چ وەدەست کەوت لەبوونمان گەردوون؟

قـازانجی چ دێتـە ڕێ لەوانـەی مـردوون؟

هیچ کەس نییە لەم گێژە دەرمخا و بێژێ

بۆ بوون و ژیان و مان و بۆ مردن و چوون؟

٨٩

زۆری وەکوو مەی قەزا و قەدەر چاند و دروون

بێهـوودە چ داگـرم خـەمی بـوون و نـەبوون؟

پیاڵـێکی پـڕم لـەبادە بـۆ تێکـە وەخـۆم

هەرچی دەبوو بێ و ببێ هەموو هاتن و بـوون

٩٠

دڵتەنگی هەبێ، دەبێ بەمەی ژەنگی بەرین

بۆ بیری نەهات و هاتِ چما خەم لەبەرین

سـۆزی کـە مـەرگ تەپڵـی نـەمانی لێـدا

ئەمن و تۆ دەگەڵ بابەدەمێ هاوسەفەرین

٩١

شــادی لەمەڕایــە، پنجــی خــەم خۆمــانین

هۆی زۆر و کەمی و ڕەوا و ستەم خۆمــانین

ڕاستی و بەزەیی و بەرز و نزم بوون ئێمــەین

قاشــووله شــکاو و جــامی جــەم خۆمــانین

٩٢

دەنگ‌بێژ و کچێک و گۆشەیەک پەیدا کەین

خۆشی سەر و دڵ لە ماچ و مەی داوا کەین

نە هومێدی بەزەی کــەس و نەترســی دواڕۆژ

با خاکــێ بــە بــا و ئــاوێ بــە ئــاگردا کــەین

٩٣

پرسی لە مراوی ماسییەک لا برژاو

کوا تازە بڵێی بە جۆگەدا بێتەوە ئاو؟

پێی گوت بە مە چی؟ کە ئێمە مردین، دنیا

دەریا بێ، تراویلکە بێ، یان هەور و ساو

٩٤

هۆزان و بلیمەتان و بیر ڕوون و پتەو

بۆ بوون و دەچن؟ نە کەس ئەمی زانی نە ئەو

تاریکەشەوێک گەڕان بەبێ ڕێ و گێژ بوون

ئەفسانەیەکیان ئەهۆنی چاویان چووە خەو

٩٥

گەردوون کە گەڕا دژی نیازی مـن و تـۆ

عاسمان بە مە چی هەشت و حەوت بن یا نۆ؟

بمرم کە لەشم بە من چی هەرچی دەیخوا

مێروولە لە گڵکۆ بێ، چ گورگی کەژ و کـۆ

٩٦

وا مانگە وەسەر کەوت لە سـووچی ئاسـۆ

مەی تێکە بخۆینـەوە شـەوێکە و ئەمشـۆ

دەس باوێ ملم، مەترسە مانگ ئـاوا بـێ

زۆر دێتەوە سەر بدا لە گڵکۆی مـن و تـۆ

٩٧

دەروێشیەکەمان کیسەیەکی بێ بن بوو

مەیگێڕی جوان ڕێبەر و پیری من بوو

پێم وایە لە مەیخانە دەبێ وەی‌بینم

ئەو ژینی لە سووچی فێرگەدا لێم ون بوو

٩٨

خۆزگەم بە کەسێ نیشان و ناوێکی نەبوو

لە شوێن پڕوپووچ خەیاڵی خاوێکی نەبوو

نەک وەک من و تۆ کوندەبەبوو ئاسایی

چاوی لە قەڵایەک بوو کەلاوێکی نەبوو

٩٩

هەر پنجە گوڵێکی سوور لە گوڵزارێ بوو

ئەو سوورییە خوێنی دڵی دڵدارێ بوو

هەر پەلکە وەنەوشەیەک لە هەردێ دەردێ

خاڵێکە لەسەر ڕوومەتی نازدارێ بوو

١٠٠

هەر خۆڵێ کە دیت چ زۆر چ تۆزکاڵێ بوو

کێڵ گەردن و کولمەسوور و چاوکاڵێ بوو

شەرمێ بکە تۆزی دەتەکێنی بەرگت

ئەو تۆزە گڵی ڕوومەتی لێو ئاڵێ بوو

## ١٠١

کەنجت دەوێ ڕەنجی دەوێ وا هات، وا چوو
کێ گوڵ دەچنێ دڕکی لە دەستی ڕاچوو
تا شانە نەبوو لەت-لەت و جەرگی پارە
کەی دەستی بە کاکۆڵی جوانێکدا چوو

## ١٠٢

خەییام کە سەرت گەرمە بە مەی دڵخۆش بە!
دەس لە ملی کچۆڵەیەک دەکەی دڵخۆش بە!
دوا ڕۆژی هەموو شتێک نەبوونە و چوونە
وای دابنێ هەر نەبووی، کە هەی دڵخۆش بە!

١٠٣

بێ دڵبەر و مەی تەمەن بەسەرچوون هیچە

بێ ڕەنگی مەی و دەنگی بلوور بوون هیچە

ئازاد و بە دڵخۆشی بژی چەند ڕۆژێک

ڕابوێرە لە هیچ بیر مەکە! گەردوون هیچە

١٠٤

خوێنتاڵە خەم و دوژمنە خۆی لێ لادە

خۆشی لە کەسێک لێوبەبزە و دڵشادە

مەیگێڕ وەرە هەر ڕەنجێ لە دنیا کێشام

بەربادە، دەسا بمگەیە خۆت و بادە

## ١٠٥

ئەم بیرە کە چین نهێنی پشتی پەردە

هەر بیرەوەریی کاس و بەداخ و دەردە

ئەفسانەیەکی دوور و درێژە و بێ بن

دەستێ بەرە بۆ پیاڵە، دەست لەو بەردە

## ١٠٦

ئەی تەکیە نشین شێخی بە سۆرە و تۆرە!

پێت وا نەبێ هەر مەستیە، کارم زۆرە

من خوێنی تری دەمژم و تۆ خوێنی هەژار

جوابم دەرەوە کێیە پتر خوێنخۆرە؟!

١٠٧

لێم بۆتە مەتەڵ بەهەشتە جێگەی حـوورە

هەنگوین و کەرە و شیر و مەی و کافوورە

با ئێمە بە مەی لێرە بەهەشتێ ساز دەیـن

تـا پیـاوی هــەژار دەگاتــە بەغـدا دوورە

١٠٨

تا باغی گوڵی بـەخت و جوانیـت لـە بـەرە

سەرخۆش بە دڵت خۆش کە چ وەختی کەسەرە؟

ئەو ڕۆژی لە دەس دەچێ وەگیر نایەتـەوە

چـەپگەردی زەمـانە دوژمنـی قەستـەسەرە

١٠٩

زێڕ گەرچی نە سەرمەیانی پیاوی ژیرە

بێ دراو و هەژار لە سەرزەوی یەخسیرە

دەستەنگیە وا وەنەوشە ملخوار و کزە

گـوڵ پێدەکـەنێ، لـە باخەڵـیدا لـیرە

١١٠

دەروێش وەرە! ئەم حا و حووەت بێخێـرە

دەمبەستەی و تۆزاوی وەکـوو گـاگێرە

خوا چاوی لەدەستت نیە ڕۆژووی بدەیـەی

ژیانێکی کە پێی داوی بە مەی بسپێرە

١١١

بشـــبووبێ وەفـا، ئێســـتە وەجـاخی کـوێرە

کێ ڕاستە لەوانی دیوتە؟ یـەک بژمێـرە

هەر کووپە مەیە هەوالـی دلـپاکە و بـەس

بێفێلـە، مەترسـە خـۆتی پـێ بسـپێرە

١١٢

کێ ڕەنجی ژیان ئەکێشێ ئازایە کوڕە

بارانێ لـە زینـدانی سـەدەفدایە، دوڕە

پیاو بۆ خۆ بمێنێ مالی دنیاشی دەبێ

پێوانە هـەلێک بەتالـە زۆرجـاری پـڕە

١١٣

ئەی خوایە لە کارت سەری زانا گێژە

شیرنایی دەنێیە دەم دەڵێی مەیچێژە

خۆت جوانی دروست دەکەی دەڵێی مەیبینە

پیاڵێکی پڕاوە، لاری کە و مەیڕێژە!

١١٤

لەم هاتنە بێهودەیە بیرم شاشە

سەرباری خەمان بیر و خەمی ئەو لاشە

مەیگێڕ وەرە قۆڵ هەڵکە گلێنەت بێنە

خەم چڵکی دڵە بەمەی بشۆرین باشە

١١٥

وا چاخی گوڵە و دار و دەوەن گوڵپۆشە

دەروێش وەرە بەر! وەرگرە مەی! بینۆشە

بڕوانە لە گوڵ بە ئەقڵی تۆ پێدەکەنێ

بۆ بیری جەهەندەم دڵ و ڕووت ناخۆشە

١١٦

مەیخانە دەگەڵ هەمدڵ و هەمدەم خۆشە

دەم بۆ دەم و دەستێ بەری بۆ مەم خۆشە

زگ کووپە نییە لەمەی جمەی بێ دەم و ژەم

بۆ لەمپەری خەم، دەم-دەم و کەم-کەم خۆشە

## ١١٧

هەوساری بە دەس خۆتە خراپە و چاکـە

هۆی خۆیەتی هەرکەس گەشە یان خەمناکە

بێچارە ترە لـەتۆ هـەزار جـار گـەردوون

بەس سووچ و هەڵەت لە سوکری گەردوون ڕاکە

## ١١٨

ڕاستت دەوێ کاکە؟ لێم ببیسی چاکـە

جـوانێکی پەیاکـە، بادەیـەک پێداکـە

خوا کاری جیهانی کرد و لێ بۆوە ئیتـر

لە سمێڵی من و لە ڕیشـی تـۆ بێباکـە

١١٩

بۆ دەردی دەروون و کوڵی‌دڵ مەی چاکە

هەر کووپە مەیە و لە سەر زەوی دڵپاکە

لافاوی خەم و کەسەر کە دەوری لێدای

مەیخانە گەمی‌نووحە، بەلەز بۆی ڕاکە

١٢٠

گۆیا لە بەهەشت مشەی فشە و خۆراکە

هۆری و کوڕ و هەنگوین و شەرابی پاکە

بۆم تێکە بە یادی کۆنە قەرزان مەیگێڕ

ئەم دەنگی دەهۆڵە تا لە دوور بێ چاکە

## ١٢١

پێشی من و تۆش ڕۆژ و شەوێک بوون کاکە!

گەردوون لە گەڕانا بوو وەکوو ئێستاکە

لەم سەرزەویە لە هەر جێ پێ وەگوێزی

خۆڵ و گڵی چەند چاو و دڵە ئەو خاکە

## ١٢٢

خوێنتاڵت ئەوێ؟ ئێسکی گرانت گەرەکە؟

بۆ تەکیە بچۆ کە دەرد و ژانت گەرەکە

مەیخانەیە جێی لێو بە بزە و ڕووخۆشان

مەیگێڕی ببینە گەر ژیانت گەرەکە

١٢٣

مەیگێڕ بەسەرت پردی سیڕاتیش کەڵـەکە

سەیرانی بەهەشت سەیری دوو چاوی بەڵەکە

زۆرم لە خودا ویست و کەمیشـی نەگـەیی

هـەر تۆبەیـە دەمـداتێ ئـەویش نەمگەڕەکـە

١٢٤

ڕامـان و کـزی بەسـە وەرە مـەی تێکـە

وەبزانە هـەموو کـاری جیهانـت ڕێکـە

خۆت دانێ لە سەر پەلکە گوڵێک ئاونگی

مـەرگت بەگزنگێکـە تەمـەن تاوێکـە

١٢٥

ئەم گۆزە کە جێ ئاوی کرێکارێکە
چاو و دڵی چەند وەزیر و خوونکارێکە
هەر پیاڵە مەیەک بە دەستی سەرخۆشێکە
کەللەی سەر و مێشکی ژیر و وشیارێکە

١٢٦

دنیا بە دەسی دەستە کەر و گاییێکە
هەر جاشەکەرە وەزیر و پاشاییێکە
دیندار بەکەسێ دەڵێن نەزان و گێژە
هەرکەس کە دەڵێن کافرە، زانایێکە

## ١٢٧

مەیگێڕ وەرە بۆم تێکە دڵم زۆر تەنگــە

کێ باشە؟ هەموو کەس دە ڕووە و سەد ڕەنگە

با مەی بپەرســتین و ئێتــر واز بێــنین

تا وا بێ موسوڵــمانەتی شــەرم و نەنگــە

## ١٢٨

چیتە لەگــەڵ ئــەم جیهانــە کەوتوویــە ملــە؟

بایی، کە دەڵێن بەختەوەرە و جێگــە زلــە

کەم پاڵدەوە ڕەشماڵی لەشت تێک ئەتــەپێ

ئەستوندەکی کرمۆڵە پەت و سـنگی‌شـلە

١٢٩

پیرم و ئەوەتەی لەبیرمە ژینم تاڵە

هەرخۆزگە بەپارە و گلەیی لەم ساڵە

لەمنت کەوێ مردن دەیەوێم های مەیگێڕ!

دوا کۆچە دەفریام خە دوامین پیاڵە

١٣٠

خۆ دوورە کتێب بگرە گەمەی منداڵە

ژیر بیری لەسەر شەراب و لێوی ئاڵە

هۆشت بێ هەتا خوێنی نەڕژتووی گەردوون

تۆ خوێنی کچی ڕەزان بڕێژە پیاڵە

١٣١

بوولێڵە کـە هـات، مەپرسـە کـەنگێی ساڵـە

مەی فڕ بکە لە خورێنی بە تاس، بـە پیاڵـە

شێخ وازی لە هەنگوین و گەزۆیە و من مەی

مەی تاڵە دەبێ هەق بێ، دەڵێن هەق تاڵە

١٣٢

هەرکەس کـە تـەواوە ناتـەواوی ماڵـە

کێ خێوی کولاو و کاڵە بۆخۆی کاڵـە

خۆێنتاڵە هەتا ملان لـە نـاو شـیرنایی

کێ ڕووگەش و خوێنشیرنە ژینی تاڵە

١٣٣

ئەم بادەیە گیانە چۆتە لاشەی پیاڵە

وەک من بە ڕواڵە جوان و ژینی تاڵە

ئەم شووشە مەیەی کە تۆ دەڵێی پێدەکەنێ

فرمێسکی هەزارانە لە خوێن دارماڵە

١٣٤

بۆ ئاوی شەوێ گۆزە شکاوێک لامە

فرمێسکی وشک نابنەوە، بێ ئارامە

کەللەی سەری شا و دەست و پلی دەروێشە

تێکەڵ بووە نازاندرێ کامەی کامە

١٣٥

مەی بیرەوەری چاخی جوانی خۆمە

هاوڕاز و گلەی ڕۆژ و شەوانی خۆمە

ئاڵە وەکوو چاوەکەم لە دووری یاران

تاڵە و بە لەزەت وەکوو ژیانی خۆمە

١٣٦

وا باشە پەنا بەرینە بەر مەیخانە

حەفتا و دوو میللەت بەمەچی شەڕیانە؟

کەوتوونە بیابانی نەزانی، بێ ڕێ

کوێرن، لە شەوی ڕەشان و خۆ لێکدانە!

١٣٧

گەردوون مەیەکەی مەرگە، جیهان مەیخانە

دەرخواردی ئەدا هەرکەسێ لێی میوانە

بینۆشە بە ڕووی خۆشەوە گەر نۆرەت هات

جەژنێکە شەپۆڕێکی دەگەڵ یارانە

١٣٨

مەیخۆر کە نەبن کاول ئەبن مەیخانە

خوێنی دەهەزار تۆبە لە گەردنمانە

بەخشین چ دەکا ئەگەر گوناهباری نەبێ؟

لە گوناهەوە بەخشین و بەزەی خوا جوانە

١٣٩

زســتانه هــەتا ڕوو دەکەمــە مەیخانــە

هەر لاسکی گوڵە و لە دەوری ئاگردانە

وەدیارە نە یاری جوان و ڕووخۆشە جیهان

تۆڵەی دەمی پێکەنینـە ئـەم سـووتانە

١٤٠

دووڕوویــی بەســە، ڕوودەکەمــە مەیخانــە

ئەم ڕیشی سـپی بـە مـەی بـڕەنگێ جوانـە

پێوانی تەمەن گەییشتە حەفتا، تـا کـەی

خۆم هەر وەکوو هەم نیشان نەدەم شێتانە؟

١٤١

وا جێــژنی بەراتـــە و شـــەوی ڕۆژی دانــە

سەرکاری خودا گــەرمی گــەز و پێوانــە

مەیگێڕ بەشی من وەرگرە خــۆم سەرخۆشــم

تا ڕۆژی مەرگ جێگەمە ئـەم مەیخانــە

١٤٢

هــەر خاکــێ هەیــە خۆڵــی لەشــی یارانــە

هــەر چــاو و دڵــی دڵــبەر و دڵــدارانە

وەک ئاو کە هەور خۆڵ و گڵیش هەڵبگرێ

تــا ڕۆژی حەشــر تــەوژمی خۆێنبارانــە

## ١٤٣

چاوبەستی فەلەک دەستی بڕیم کوێرانـە
خستمیە جەهەنـدەمێک و نـاوی ژیانـە
دەردی مــە ئەگــەر نــەهاتوان بیــزانن
ڕوو ناکەنە ئەم خەیمەشـڕەی خەمخانـە

## ١٤٤

دڵــتەنگی مــەرگ نابــێ ئــەوی لێزانــە
ئــەم مانــەوەمان وچــانی ڕاگوێزانــە
تێر سەیری گوڵت نەکردووە بۆتەوە گـڵ
لــە شــوێن گوڵــەنەورۆزە گەڵاڕێزانــە

١٤٥

حەیفم لە دڵێ دێ کە بەبێ سووتمانە

دڵـــداری تیـــا نـــەکردووە هێلانـــە

هەر ڕۆژێ کە بێ دڵبەر و بێ دڵداری

بـــێ نرخـــە، پڕوپووچـــە، زیـــانی ژیانـــە

١٤٦

خاکێ کە لە ژێـر پـێ و پلـی شـوانانە

سنگ و مەمک و کولم و دەمی جوانانـە

هەرخشـتێ لـە لا قـوژبنی دیوارێکـە

یان شانی وەزیرە یان سـەری سوڵـتانە

١٤٧

لەم جەغزە کە شوێنی هاتوچۆی هەمووانــە

بێ ژێر و سەرە و دوور لە پـۆان و سـووانە

کێ زانی لە کوێوە هـاتووە و کێـوە دەچـێ؟

هۆزان و نەزان وەک یەکـە، سـەرگەردانە!

١٤٨

گوڵ یاخە دەکاتەوە بەرانبەر بـە شـنە

بولبول دڵی خۆشە کەوتـە ئـاواز و قنـە

تا تۆش و گوڵیش نەبوونە تۆزی بـەربا

مەی بێنە لە گوڵـزارێ بخـەین باروبنـە

١٤٩

تازەم کە بە کەونە مەی، جیهانیش کەونـە

زۆر لاش و ســەری تێـوەدرا ئــەم تەونــە

چۆن هاتی؟ چلـۆن دەچـی؟ چلـۆن بـووی و دەبی؟

خەو داتنەگرێ وەکـوو خـەیاڵ و خەونـە

١٥٠

هــەرچیکی هەڵــێ، بەشــی لــە ئـاوا بوونــە

سەرکەوتنی هەوراز و بەرەوژێر چوونە

شین بووی لە زەوی، پێدەگەی و دەتهێـڕێ

ئاشێرە خودا و ئاشەکەشـی گەردوونـە

١٥١

پەنجەی گوڵی ڕوومەت گوڵەکەم گوڵچینە

پەرژینی بەگوڵ، گوڵ لە گوڵم پەرژینە

تا شینکە لە گۆڕە با بەە یـەکتر شـاد بـین

داخۆ چ دەمێ لە دەوری گۆڕت شینە؟

١٥٢

مەی تێکە هەرایە پێم دەڵێن بێدینە

چۆن ڕەنگی بەرم؟ پەڕۆم لە هەشدا شینە

بەرماڵە گوناهپۆشەکەشـم وا شـڕ بـوو

هەڵناگری تەقەڵ بـەبارێ بیکـەین پینـە

١٥٣

بەخشین لە گوناه و هەڵە چاوپۆشینە

تۆ چۆن هەڕەشەت بە ئاگری پڕتینە

بمبەخشی بە نوێژانەوە کەسمان لە کەسە

بە گوناهەوە بمبەخشە، دەڵێم بەخشینە

١٥٤

مەیگێڕ وەرە دەس مەگێڕەوە مەی بێنە

مەی ژینە لە ناو لەش و لە ڕەگدا خوێنە

کێ دیتی شتێک کە ئاگر و ئاویشە؟

مەی ئاوی ژیانی مەیە، خەمسووتێنە

### ١٥٥

بـایی مەبـە بـە ژیـان و کـەمێ ڕامێنـە
زۆری وەکوو تۆ ئێستە سەتی لە شوێنە
دڵخۆش بە هەتا ماوی مەرگ وا لە کەمین
تـا تـۆش نـەرفێنراوی بەشـت بڕفێنـە

### ١٥٦

بێهوودەیە بەس لە سەر مە خۆ بنوێنە
بگـرە و بکـوژە، کـۆ کـەرەوە، بسـتێنە
سەرکاری مەرگ گەلێ لە تۆ زۆردارتر
دەتگاتە سەر و دەڵێ بەشی من بێنـە!

١٥٧

نازدارە! بەهارە، سەوزەیە، دەمئاوە

کوا دەفر و پیاڵە مەی؟ دڵم تەنگاوە

گەردوون گەلێ وەک تۆ و منی سەدجار-سەدجار

بە پیاڵە دروست کرد و لە بەردی داوە

١٥٨

ئەم بوون و ژیانەی هەیە چۆن ڕوویداوە؟

ئەنجامی چییە و بۆچییە؟ چی بەدواوە؟

هیچ کەس نەبووە و نیشە بەڕاست بیزانێ

هەر کەس بە خەیاڵ شتێکی بۆ هەڵداوە

١٥٩

هەر کارێ دەکەم ڕۆژی بەرێ نووسـراوە

بۆ چاک و خراپ خوا قەڵـەمی لێـداوە

پرسیار و گوناهی کردەوەم بـۆ لـە منـە؟

نووسراوە، دەبێ بیکەم؛ ئیتر چی‌ماوە؟

١٦٠

گەردوونی چەوێڵ هەر بەچەپی سووڕاوە

هـەر بۆیـە ئـەوی ڕاسـتە تیـا دامـاوە

بڕوانـە لـە هاواڵـەتی شووشـە و پیاڵـە

خوێن کەوتە نێوان و لێو بە لێو چەسپاوە

## ١٦١

ڕۆیـــین و زەمـــان پەشـــێو و ئاڵـــۆزاوە

سەد گەوهەر و دوڕ یەکێکی لێ نەسماوە

داخی بە دڵم هەزار وشە و بیری چاک

کـــەر بوونەتـــە لەمپـــەر و نـــەبێژراو مـــاوە

## ١٦٢

دیم پـــیرێ لـــە میخانـــە ســـەری دەخـــولاوە

ناترسی؟ وتم، کە بمری؟ چیتبومـاوە؟!

فەرمووی وەرە پێداکە! گەلێ وەک من و تـۆ

ڕۆویشـــتن و کـــەس نەهاتـــەوە لـــەو لاوە

## ١٦٣

چاوجوان وەرە لام، بە خـەم بڵـێ بـەو لاوە
لـێم هاڵــێ هــەتا داوی ژیـان نەپسـاوە
نەورۆزە چەمەن سەوزە دەمێ سەرخۆش بین
تا سەوزە لە سـەر گۆڕەکـەمان نـەڕواوە

## ١٦٤

کێ ڕۆژی بەرێ قوڕی مـنی شـێلاوە؟
کوڵکە و مەرەزم بە کام تەشی ڕێسـراوە؟
کارم کە یـەکی نـەگرت و لـێم ئاڵـۆزا
سووچم چیە؟ لای خۆتـەوە هەڵـپێچراوە

١٦٥

دنیات بە خەیاڵی خۆ لە توربێن ناوە

زێڕت هەیە عەرزت هەیە دێمە و ئاوە

لەو ڕۆژی مەرگ سەرت ئەدا سەربەسەرین

هەر دوو گەزە خاکی گۆڕ و تۆپێک جاوە

١٦٦

ئەم کۆنە سەرا و پەردە کە دنیای ناوە

شایی لە بەرێک، شینە لە پێنسەد لاوە

ئەم خوانچەیە بەرماوی هەزار جەمشیدە

گۆڕە و گەلێ بارامی تیا نێژراوە

١٦٧

لەم ڕێگە درێـژەوە کـە مـەرگی نـاوە

کێ هاتەوە بـاس و خەبـەری هێنـاوە؟

وەستان لە دووڕێیانی نیازی پـڕوپووچ

بێهوودەیە، هەرچی چوو نەهاتـە دواوە

١٦٨

هەر دەرد و کـوڵ و ژانـە ژیـانی نـاوە

تۆ بەفری گـەلاوێژ و مـەرگ وەک تـاوە

ئەو تاوە تیا مـاوی مـەتاوێوە بـە خـەم

کوا ئاوی ترێ؟ هیمـی جیهـانیش ئـاوە

١٦٩

لەم خانە دوودەرگانە کە پێت تێ ناوە

هاتووی بەپەلە و دەچیە دەرێ لەو لاوە

ژینت بە خەفەتبارییە مەرگیش سەربار

پێت وایە نەدۆڕاوی؟ خەیالت خاوە

١٧٠

گەردوون چتە؟ کێ بێفەڕە ڕووت لێ ناوە

تێر و تەسەلە و بەریکی پڕ لە دراوە

بێ شێو سەر ئەنێنەوە هەزاران زانا

بمبوورە! ئەگەرچی پیری، بیرت خاوە

١٧١

هەر سەوزە کە تازە لـە دەم ئـاوێ ڕواوە

وەک تازەخــەتێ لــە لێــوی لاوێ ڕواوە

هەنگاوێ لە سەر شـینکە بـەپارێز دانـێ

ئەو شینکە لە خـاکی مەسـتەچاوێ ڕواوە

١٧٢

بارانـــــە دڵـــــۆپێکی ڕژا دەریـــــاوە

خۆڵێکە گەڕ و خولیە لە بـەردەم بـاوە

ئەم هاتنی ناو ژیان و چوونەت چۆنـە؟

مێشوولەیەک و تۆزێ گـەڕا و گـەڕیاوە

١٧٣

خشت پیژی هەتا کەنگێ بە سەر دەریاوە

ئاخ چەندە ڕقم لە بتپەرس هەڵساوە!

کابرای کە دەڵێ دەچتە جەهەندەم خەییام

چۆن زانی؟ چ دێوێک خەبەری پێداوە!؟

١٧٤

خوێنتاڵی مەلا بە ڕیش و پەشم و جبەوە

ئەمڕۆش لە دەست دەچێ بە بیری سبەوە

زۆر وشکی دەبی بە دەستەچیلەی ئاگر

فەرموو وەرە مەیخانە دەمێ تەڕ ببەوە

١٧٥

خوو بەس بدە خەو کە هۆش و بیرت پتــەوە

ڕابوێرە ژیان بە مەی ئەگەر ڕۆژ و شــەوە

مردن کە برای گەورەیە بۆ خــەو هــەر دێـت

ئەو کاتە لە ناو نــوێنی گــڵا تێـر بخــەوە

١٧٦

دەرد و خەمی من کــە هێشــتە نەبڕاوەتــەوە

خۆشی تۆ کە دەنگی لــە جیهــان داوەتــەوە

هەردووکی دەچێ نە ئەو دەمێنێت و نە ئــەم

گەردوون لە گەڕە و هەزار تەڵــەی ناوەتــەوە

## ١٧٧

مەیگێڕ وەرە بۆم تێکە ئەوا نیوە شەوە

بەس بیرێ لە مزگەوت و کەنشتان بکەوە

دڵتەنگی جەهەندەمی و بە ئاواتی بەهەشت

دایناوە خودا کوێندەری بەس لێکیدەوە

## ١٧٨

شێخ ویستی لە دەردی یار و مەی چا بمەوە

بۆ ژینی لە پاش مەرگ ئەشێ پا بمەوە

نازانێ کە بۆچ هۆگری یار و بادەم

پێم خۆشە لە حەشریش دەگەڵی ڕابمەوە

١٧٩

خۆڵی لەشەکەم بە تایبەتی خڕ کەنەوە

مەی لێ بدەن و باشی تەڕوبڕ کەنەوە

خشتێکی بپێژن لەمە بەڵکوو جارێک

مەیخانە کەلێنێکی بەمن پڕ کەنەوە

١٨٠

چم بیستووە لەم جیهانە یان چم دیوە

زانیومە چیە، هیچ نەبێ نیوە و نیوە

مردن چیە؟ هەرچی دەکەم و دەکرێنم

شێواوم و سەر نابەمەدەر لەو شێوە

١٨١

مـــردووی بـــەرە مەیخانـــە ڕوحـــی تێدایـــە

ئەو بۆنی لە مەی دێ نەفەســی عیسـایە

دەرخۆنە کە دەخرێتە سەری کووپەی مـەی

تاجی سەری سەد کاوس و جەم هێژایـە

١٨٢

چـاوم لـە لکـی هومێـدە بـۆم دانایـە

ئەی خۆزگە کە داشدەهات بەری هەبوایە

زیندانـــە ژیـــانم دەرەتـــان نـــابینم

ئاڵۆز و گـرێ پووچکەیـە ئـەو هەودایـە

١٨٣

مەیگێڕ وەرە ئەم هۆشە بەکارم نایە

مردن ڕەشەبایێکە ژیانم کایە

بۆم تێکە لەگۆزەی مەیەکەت هاکا دێت

گۆزێک لەگڵی منیش لە ناو کڵدایە

١٨٤

شووشەی مەیەکەت بۆچی ڕژاندم خوایە

وەک شووشە نەشە و دڵت شکاندم خوایە

مەیخۆرە منم کە چی یەکێ تر دەگرێ

بمبوورە لە پەردەدا گەیاندم خوایە

١٨٥

ئەم هاتن و چوونی ئێمە چی لـە دوایـە؟

کـێ وا هەیـە لـەم گلۆلـە هەڵـکا تایـە؟

ئەم لاشە هەموو دەکەونە ئاورگی نـەمان

سووتمانی وەهام نـەدیوە؛ دووکـەڵ نایـە!

١٨٦

ئەی خوایە چ بێ وەفایـە ئـەم دنیایـە

دەرد و ڕک و کینە گشتی هەر لـەم ڕایـە

بڕوانێ لە ناو دڵی ڕەشی خاکی ڕەشـا

زۆر گەوهـەری تێدایـە کـە نرخـی نایـە

## ١٨٧

بیر کەم بتەنە! ڕایەڵـەکەت بـێ پۆیـە

مەی ڕۆکە لە کووپە چ ڕەوای ڕۆڕۆیە؟

ئەمڕۆ کە بە فیز و قۆزی سۆزی تـۆزی

بابردەڵە! پێت وابوو جیهان بۆ تۆیـە؟!

## ١٨٨

هەر بێنەبەرە و هەڵـخول و هـات و چۆیـە

گوێ هەڵخە هەموو دەنگی بژی و ڕۆڕۆیە

خەرمانی ژیانە سـوورە گـەردوون سـەرکار

ڕۆ کـردن و پێـوانی مەیـە لـەو کۆیـە

١٨٩

گاییکە لە عاسمان و ناوی کۆیە
گاییکە دەڵێن هەڵگری هەرد و بۆیە
سەیری کەرەگەل بکەی لە ناو ئەم جووتە
گەر ژیر و بەبیری سەیری خۆش بۆ تۆیە

١٩٠

دۆستێکی بەڕاستی خەمڕەوێنمانە مەیە
ئیتر هەموو دۆستایەتی دنیا گەمەیە
چاخی گوڵ و یارێکی گوڵەندام و مەیەک
ڕابوێری بەدڵ دەمێک، ژیان هەر ئەمەیە

١٩١

پشکوتووه گـوڵ چ دیمـەنێ شـەنگی هەیـە
مەیگێڕ وەرە بۆم تێکە دڵم ژەنگـی هەیـە
بەس بۆم بڵێ چیـرۆکی بەهەشـت و حـۆری
خێوە و جنە ڕەنگی نیە هەر دەنگی هەیە

١٩٢

دنیایــە لــە کــەو دە! بێگونــاهێکی نییــە
کەس بێ هەڵە نەژیاوە لە سەر ئەم زەوییـە
من کردە خراپ و تۆش خراپەم تووش کەی
جیاوازی لە نێوان مـن و تـۆ خوایـە چییـە؟

## ١٩٣

هەر ڕێیە بڕیم گشتی هەڵە و لاڕێیە

وا دێمە پەنات باری گوناهم پێیە

بمبەیتە بەهەشت ئەگەر بە نوێژ و ڕۆژوو

سەودایە، ئیتر بەخششەکەت لە کوێیە؟

## ١٩٤

مەیگێڕ وەرە مەی بێنە زەبوونی بۆچی؟

با پێبکەنین داخ لە دەروونی بۆچی؟

کێ پرسی بەتۆ کرد لە نەبوون و بوونا؟

بێهوودە کزی بوون و نەبوونی، بۆچی؟

١٩٥

مەیخۆرەوە بم بە تۆ چی؟ تووڕەی بۆچی؟

تۆ بۆچی بە زۆنگی خەمی مندا ڕۆچی؟

چیت داوە لە ئاکاری ئەم و ئەو کاکە؟

باشتر ئەوەیە کە خۆت بزانی تۆ چی؟

١٩٦

مەیگێڕ وەرە گا زەوی لە پشتە، بەمە چی؟

بادەم بدەیە جند و فرشتە بەمە چی؟

مەیخانەیەکم نیشان دە ئەوسا دنیا

مزگەوتە هەمووی، دێر و کەنشتە، بەمە چی؟

## ١٩٧

ژیانت چیە؟ تا چووک و شلی، شاگردی

وەستای کە گەیشتی، پاشی: پیری، مردی

پوختایی وتار لە من ببیسی باشە:

تۆزێکی لە خۆڵ بەرز ببووی، با بردی

## ١٩٨

مەی تێکە وەخۆ دەرفەتە؛ هاکا مردی

لەم ژێر گڵە بێ هەواڵ و بێ هاودەردی

وا پێتی ئەڵێم شتێک لە لای کەس مەیڵێ

نابێتەوە گوڵ پەلکەگوڵێ با بردی

١٩٩

بێ خەم بە! ژیان هەڵێکە هاکا مردی
تاوێری مەرگ گلا و لە بنیا وردی
نازانی لە کوێوە ناردرای؛ سا بە خودا
ناشزانی مەرگ کە مردی، بۆ کوێی بردی

٢٠٠

گەردوون وەکوو دێو بەراوەژوون ئاکاری
هاواڵی نەزانانە، دژی زانیاری
مەیگێڕ وەرە هۆشم بەرە بەڵکوو جارێک
لێی تێکچێ، بەلای ئێمە بچەرخێ باری

٢٠١

گەردوون کە بە زانیـاری بکـردا کـاری
چۆن وا پڕ ئەبوو لە هیچ و پووچ و خواری
کەی ڕاستە هـەژار و لێـو بـەبارن زانـا
بێ مێشک و کەریش لە زێڕە ناڵ و باری!

٢٠٢

گـەردوون وەکـوو منداڵـە لـە بـەر بێکـاری
خستینیە دەرێ وەک مت‌وموور بۆ یـاری
تاوێکی لە بەردەستی ئـەوا دێـین و دەچـین
دەخرێینەوە سـندوقی نـەمان یـەکجاری

٢٠٣

ناچاری ئەشێ باری مەرگ هەڵبگری
ناشێ هەموو دەم لەترسی مردن بمری
خوێن و ڕەگ و پێستێک و دو-سێ ئێسقانێک
وەبزانە نەبوون، بۆچییە خەم دادەگری؟

٢٠٤

خەم بۆچی لە سەر بوون و نەبوون دادەگری؟
دوارۆژ چیە کەی دێ؟ چتە وا بۆی دەگری؟
مەی فڕکە مەترسێ بە قەرز، نازانی
نێوانی هەناسەیەک دەژی یان دەمری؟

٢٠٥

ڕابوێرە دڵت خۆش کە چما خەم لەبەری

دەرفەت لە دەست ئەگەر نەدەی بەختەوەری

یەک جارە کە دروایەوە هەڵنادەیەوە

هۆشی بدەرێ مرۆی، نە سەوزە و کەوەری

٢٠٦

زستانی ژیانە وا قەلی مەرگە قری

پیری ملەیەک بوو ڕەگی لاویمی بڕی

باڵداری جوانیم لە لکی ئاواتم

هاوارە لە من چ زووبەزوو نیشت و فڕی

٢٠٧

نەیخۆی و نەپۆشی ئەدی بۆچیت کۆشــی؟

سەرقاڵی شەو و ڕۆژ دەکڕی و دەفرۆشــی

لێو تەڕکە بەمــەی لێــوی کچۆڵــێک بمــژە

ژێر گڵ هەر ئەبی، پەرۆشی یان دڵخۆشی

٢٠٨

ئۆخەی کــە نــەما بــاوی خەیاڵــی خاڵــی

مەیگێڕی دەبینمەوە بــە بــادەی ئاڵــی

گێرەی ڕەمەزان بەربوو، ئەوا جێژن هات

دەمبێنی لە دەم گا و کــەران داماڵــی

## ٢٠٩

شێخێ بە ژنێ خراپی گوت بێ شەرمی
بۆ هەرچی دەست بۆ بەرێ ساز و نەرمی
پێی گوت بەڵێ من وەکوو دیارم هەر وام
تۆش داخۆ وەکوو نیشان دەدەی دڵگەرمی؟

## ٢١٠

پڕژاندی هەور لە دەشت و دەر بارانی
بێ مەی بی دەمێ تامی ژیان نازانی
وا ئێمە لە سەیری سەوزەزارین داخۆ
سەوزەی گڵی ئێمە کێ بکا سەیرانی

## ٢١١

گەردوون بەدزی دوێنێ لە لام درکانی

هەرچی بەسەرت دێ لە دەس ئێمەت زانی

لەم چەرخ و خولەمدا دەسەڵاتم بوایە

خۆم ئێستە ڕەها دەکرد لە سەرگەردانی

## ٢١٢

ڕابرد تەمەنم هەموو بە نافەرمانی

نەینووکی دڵم لە چەوتی ژەنگی هانی

هێشتا بە هومێدی بەزەییم چون هەرگیز

پێم وانەبوو دوانی، هەر بە تاکم زانی

٢٠٥

ڕابوێره دڵت خۆش که چما خـەم لەبـەری

دەرفەت لە دەست ئەگەر نەدەی بەختەوەری

یـەک جـارە کـە دروایـەوە هەڵـنادەیەوە

هۆشی بدەرێ مرۆی، نـە سـەوزە و کـەوەری

٢٠٦

زســتانی ژیانــە وا قــەلی مەرگــە قــڕی

پـیری مڵـەیەک بـوو ڕەگـی لاویمـی بـڕی

باڵــداری جــوانیم لــە لکــی ئــاواتم

هاوارە لـە مـن چ زووبـەزوو نیشـت و فـڕی

٢١٥

مـەیخۆرەوە نی و لـە ئێمـە هاتوویـە گەمـەی
خۆشت بەدزی هـەزار دزی و حیـزی دەکـەی
فیزمان بـە سـەرا لـێ مـەدە مەسـتی ناکـەی
هەر کارێ دەکەی هەزار کەڕەت خۆزگە بە مەی

٢١٦

دەسـتم کـە بڕۆیبایـە خـودا ئاسـایی
گـەردوونێ تـرم دەخسـتە ڕوو سـانایی
بەدبـەختی بەشـی نـەزان و نامـەردان بـا
دڵخۆشـیم ئـەدا بەرانبـەری زانـایی

## ٢١٧

جوانی بەپەلـە و بـەبێ نەوەسـتان ڕۆیـی
ڕۆژگاری ژیـان وەک شـەوی مەسـتان ڕۆیـی
ئـەم ژینـە کـە هـەر دەمێکـی دنیـای دێنـا
داخـم کـە بـە بێهـوودە لـە دەسـتان ڕۆیـی

## ٢١٨

مەیگێڕ مەیـە بـەرباری خـەمان، مـەی بابـێ
چـا نابـێ جیهـان بـە ئێمـە، بـا دڵ چابـێ
چت دێتە بەرێ لە ڕێی ژیـان گـوێ مـەدەرێ
هـەرگیز وەکـوو ئـاواتی دڵـی کـەس نابـێ

٢١٩

چۆن تۆبە لە مەی دەکەی هەتا مەی مابێ

ئـەو ڕۆژە مـەخۆرەوە کـە پەیـدا نابـێ

نەخوازە بەهار و چیمەن و دیمەنی گوڵ

تۆبەی چی؟ هەزار تۆبە لە تۆبەی وا بـێ

٢٢٠

یان دەچمە بەهەشت هۆری لە دەورم کۆ بێ

یان ئـاگرە جێگـەم بـە چـزە و بۆسـۆ بـێ

جوانێک و مەی و نـەی و بـەهارێک بـۆ مـن

چیم ناگەرەکە، قەرزی بەهەشت بۆ تۆ بێ!

٢٢١

گیا شینی بەهاران هەڕەتێ خونچـە وەبـێ

لات وایە بەهەشت ئەگەر هەبێ وەک ئەوە بێ؟

مەیگێـڕ وەرە تـا بەهەشـتی دنیـا مـاوە

هەشتێکی لە مشتە بێنـە نـەک نـۆ بـێ، نـەبێ

٢٢٢

بـۆ ژانی دڵان هـەر مەیـە دەرمـانی بـێ

زانـا ئەوەیـە تـامی لـە مـەی زانیبـێ

ئەو کۆنە پەڕۆی لێوی لە مەی پێ دەسڕن

بەرماڵی هـەزار سـۆفی بـە قوربـانی بـێ

٢٢٣

فەرمووتە عەزابم هەیـە ترسـوو لـێ بـێ

لەم گفتە دەبێ ئـەوی بترسـێ کـێ بـێ؟

تۆ ڕەحمەتی، لە کوێ بی، عەزاب بێکارە

ئەو جێیە کە بێ تۆیە دەبێ لە کوێ بـێ؟

٢٢٤

دڵـبەر کـە بمانـداتێ مـەیێک و ماچـێ

بـەرماڵ و ڕدێـن بـە تـوونی ئـاگردا چـێ

دڵتەڕ لە جەهەندەما بێ، سا دەرکی بەهەشت

گیراوە بـە قـوڕ تـازە کەسـی تـێ ناچـێ

### ٢٢٥

ئەو جوانە کە خۆم دەڵێم بە تەنیا جارێ

باوەش بە یەکا بکەین لە دەم ڕووبارێ

چیمەن گوڵ و سەوزەپۆش و ئێمەش سەرخۆش

پێم وابێ بەهەشت وایە، بەڵام لێبارێ

### ٢٢٦

تا هەل هەیە دڵخۆش بە! ژیان ڕادەبرێ

لەم خانوە ڕەشەی لەشە گیان دەردەکرێ

ئەم کاسە سەرانەی کە دەبینی سۆزی

ژێر قاچ و قولی کاسەکەران ڕادەخرێ

٢٢٧

تای ماشەری ژین بە بێ وچان هەڵدەکرێ
زانا ئەوە دڵخۆش دەژی بێ خەم دەمرێ
مەیگێڕ خەمی چیتە بۆ سبەینێی قیامەت؟
بۆم تێکە هەتا دەرفەتە؛ شەو ڕادەبرێ

٢٢٨

زانا لە جیهان کەسێکە خەم دانەگرێ
دڵتەڕ بژی، وشکی لە دڵا ڕانەگرێ
تا سواڵەتی ژین بە بەردی مردن دەشکێ
دەستی لە ملی شووشە و یار لا نەگرێ

٢٢٩

ئـەم خەڵـکە لـە کارگـای خـودا دێتـە دەرێ

هەر کاری ئەویشە سیس دەبێ و هەڵـدەوەرێ

ئەی خوایە! ئەگەر باش بوو لە پای چی نەتهێشـت؟

گەر پووچ و چرووکـە کێیـە کردوویـە بـەرێ؟

٢٣٠

چاوجوان نەدەمی خەوە دە هەڵبێنە سـەرێ

مەی تێکە لە کووپە چەند قومێکم بدەرێ

هاکا قـوڕی خـاکی مـن و تـۆش هەڵشـێلن

بکرێینەوە کووپە مەی لـەکن گۆزەکـەرێ

## ٢٣١

دڵخۆشی دەدا مەی و دڵی خەم دەبڕێ

فرمێسکی ڕەزانە، ئەشکی خەمبار دەسڕێ

زۆر سەیرە لە لام کەسێکی مەی دەفرۆشێ

چی چاتری پێ دەکڕێ؟ مەگەر مەی بکڕێ!

## ٢٣٢

مەیخۆرەوەکان دەوەرن و ساز دەین کۆڕێ

مەیگێڕ وەرە با دەفری شەراب هەڵچۆڕێ

دەیزانی خودا ڕۆژی بەرێ مەیخۆرین

تێکی مەدە! زانستی خودا ناگۆڕێ

٢٣٣

وەبزانــە جیهــان بــە ئــارەزووی تــۆ دەگــەڕێ

ئەم چــەرخ و خولەی هەمووی بە فووی تۆ دەگەڕێ

وەبزانە کە ســەد ســاڵــی ژیــای، پاشــان چــی؟

مەرگێکە لەسەر ڕێگــە لــە دووی تــۆ دەگــەڕێ

٢٣٤

هەر شەو بوو لە مەیخانــە دەهــات ئــاوازێ

خۆشی لە کەسێک لە ئێمە مەی دەخــوازێ

بۆ مات و کزی؟ گەلێکی وەک تۆ گەردوون

کــردوونی بــەتۆز و خۆڵــی ســەر ڕێبــازێ

٢٣٥

هەرکەس کە دەسی بە تیکە نانێ بڕەسێ

لاکۆخێ هەبێ، شەوانە تێیدا وەحەسێ

چەند خۆشە ژیانی وا چ ئازادە بەدڵ

بۆ خۆی بێ، نە ئاغابێ، نە بەردەستی کەسێ

٢٣٦

بڕوات کە بە دنیایە لەتەکما بە دەمێ

بڕوانە لە گۆڕسان و ڕامێنە کەمێ

مێروولە کە کێشەوەی دەکەن لێر و لەوێ

هەریەک لە دەمیدایە گڵی خونچە دەمێ

٢٣٧

ئەو کۆشکی ملەی دەکرد دەگەڵ عاسمانیێ
شاهانی دەکەوتەوە لە دەرک و بانیێ
دیتم پەپوو سێمانەیە لێی دەخوێنیێ:
کوا بگرە و بەردە؟ بەزم و ڕەزمت کوانیێ؟

٢٣٨

بۆم بانکەنە مەیگێڕەکە با مەی بێنیێ
پیری چلەکێش بادەیە خۆی بنوێنیێ
سەرخۆشیێ بناڵێنیێ لە نیوەی شەودا
سەد نوێژی ڕیا بازی مرومۆچ دێنیێ

٢٣٩

کاتـێ لـە زەوی وەنەوشـە سـەر دەردێنـێ

سروە دەمی خونچە ماچ بکا و ڕایژێنێ

چەند خۆشە لە گەڵ خونچە دەمێ ڕایبوێری

تۆ تۆبە شکێن و ئـەو دڵـت نەشـکێنێ

٢٤٠

هۆشم کە هەبێ خەفەت دڵـم دەردێنـێ

سەرخۆش کە دەبم هۆش لە سەرم نامێنـێ

کاتێ کە نە زۆر مەست و نـە زۆر وشـیارم

گیانم بەفیدای ئەو دەمە، دنیـا دێنـێ

## ٢٤١

لاوێچێ لە مەی سەد دڵ و سەد دین دێنێ

هەر تاقە قومێک مەملەکەتی چین دێنێ

چی خۆشە لە سەر زەوی، وەکوو مەی نابێ

تاڵێکە هەزار گیانی شیرین دێنێ

## ٢٤٢

سەرخۆش دڵی‌نایە پیاڵەیەک بشکێنێ

هەر تۆزێ لەبار و ڕێک و پێک بنوێنێ

خوا ئەو هەموو لاشە ناسک و لاو چاکە

بۆچ ڕێکی ئەخا و لە داخی کێ ئەیڕزێنێ؟!

٢٤٣

دنیـا وەکـوو خۆیـەتی و مـرۆ نامێنـێ

تۆ تۆزی ئەویش هەر وەکوو سۆزی و دوێنێ

ئێمەش کە نەهاتبووین وەکوو خۆی وابوو

لێشـی دەر ئـەچین کەمایەسـی ناهێنـێ

٢٤٤

چاوجوانە بەیانـە و کەڵەشـێر دەخوێنـێ

بانگێکی لە مەیگێڕ بکە با مـەی بێنـێ

داخۆ شنەبای بـەیان، خوناوکـەی باران

کەی بێنێ لە سەر گۆڕەکەمان بڕژێنێ

٢٤٥

دیم گۆزەکەرێک قوڕی دەشێلا دوێنێ

دەنگێکم ئەبیست باوکە کوڕی ئەدوێنێ

ڕۆڵەم بەزەییت بە بابی خۆتدا نایە؟

مەمشێلە بە قەو بە هێمنی پێم لێ نێ!

٢٤٦

چاوم کە بە گریانەوە بوو، یار تاوێ

دەیڕوانی لە ئەشکی من بە گۆشەی چاوێ

بەم چاکەیە لە نیازی گەییشتم کە دەڵێ

تۆ چاکە بکە و بیبە دەئاوی هاوێ

٢٤٧

مەیگێڕ لەمە بڕوانە بە سیلەی چاوێ

ڕابردوو، نەهاتوو، لە سەرت دەرباوێ

تاکەی خەمی زوو کۆچ دەکەم و دێر هاتم؟

مەی تێکە وەخۆین درەنگ و زووی پێ ناوێ

٢٤٨

شەو فێنک و دەر سەوز و وەها مانگەشەوێ

با بخۆینەوە کوا هەڵێکی دی هەڵدەکەوێ؟

مانگ هەر دێ، بەهار دێتەوە، تەنیا ئێمەین

دەمرین و دەبینە گیا و گڵ لێر و لەوێ

٢٤٩

پرسیم و نوارِیم و گەڕام لێر و لـەوێ

هیچ بەڵگە نەبوو تەمی گومانم بـڕەوێ

ناژین بە خەیاڵی ئەو بـەهارەی نایـە

تا ماوە ژیان بادە لە دەسمان نەکەوێ

٢٥٠

چووکێک لـە کەلاوەیـەک لـە بـەر لابایـێ

دەیکوڵـی بـە دنـدووکی، سـەری پاشـایێ

پـێم وابـوو دەڵـێ: بمگـرە گـەر دەتـوانی

بەو کەللەیە سوێند ئەخۆم لە دەستت نایـێ

## ١

له لامـی، گیـان پەپوولێکـه لـه ڕووتـا

ئەگەر لێم دوور دەبی دڵ دێ بە دووتـا

له نێزیکـی و لـه دووریـت خاکەسـارم

ئیتـر یـا دڵ نییـه یـان گیانـه سـووتا[1]

## ٢

دڵـم دەیـزانی ڕادەبـری بـه سـەرما

بـەڕێی کـرد دوا هەناسـێکی لەبـەرما

بـه چـاوم ئاوڕشـێنی ڕێگـەتم کـرد

گیان دەرکەوتـه پێشـواز و لـه دەر مـا



١- ئەم [illegible] گوتراوە.

٣

هرووژمیـان کـرده دڵ تیپـی مژۆڵـت

بـەخوێن پـاراو کـرا جـێ‌ژوانی چۆڵـت

دەسی دڵ بگرە خوێنڕێژی هـەتا کـەی؟

بـەزێکت بـێ بـە دڵـداری کلۆڵـت

٤

لە تینی کوڵمەکەت جەرگ و دڵم سـووت

لە تاوی چاوی جادووت بوومە هارووت

بەهەشت و کەوسەر و هـەنگوین و شـیری

بـە شاباشـی دڵـۆپێک ئـارەقی ڕووت

٥

دڵی شێتم وەها گرتی گرۆ پێت

له تاوان پێی دەتاوان بەردی بەرپێت

چ ژین‌سەختم، چ دڵ‌سەختی گوڵی من

کزەی دڵ وەک کزەی با دێتە بەر گوێت

٦

بە چاوی تۆ دڵی زار و گرفتار

بەدڵ مەرگی دەوێ ڕۆژێ هەزار جار

لە ڕێی ئەم جوانیەت تۆزێک بەزەت بێ

هەژاری تۆم لە مردن مەمکە ڕزگار

٧

لــە تاریکــایی پرچــت بــێ ســەرەودەر

دڵم گێژ و هــورە چەشــنی ســکەندەر

بـــەڵام ئـــاوی ژیـــان لاجـــانگی تۆیـــە

بەڵام ڕەشماری بسکت بوونـە لەمپـەر

٨

بەژن شۆڕ و کەزی شۆڕ و خەزێم شۆڕ

سەرەوشۆڕم دەکەن سەرشۆڕ بەرەو گۆڕ

هــەژار و خــوار و لــەش‌بیمــار و دڵــدار

دەبا وام لێ بێ مافی خۆمە هــەی گــۆڕ!

٩

شـەوە دنیـا وەکـوو خاڵـت سـیاپۆش

وەرە بـــا دەردەدڵ بکـــرێن فـــەرامۆش

دەسـم دەسـتۆکە بـا بتگرمـە بـاوەش

ئەگەر مردم لە خۆشیان، چاوی تۆ خـۆش

١٠

بە سەرگەردانی ژێـر گەردانەکـەت بم

بـــەلا گـــەردانی بـــاڵا جوانەکـــەت بم

ئەوا تۆم دی لە سەر کوشتەت دەکەی شـین

بـە گـۆری چـاوە پـڕ گریانەکـەت بم

## ١١

دەمی کۆچ بارەکەت ناچێ لە یادم

دەبێ وەک کوشتمت بشپرسی دادم

«کە بارگەت بۆ هەوار تێک‌نا دڵی من

شکا ئەستووندەکی تاوڵی مرادم»[1]

## ١٢

دەپرسی چۆنە چێژەی خەم دەچێژم؟

لەبەرچی دەرد و زووخاو هەڵدەڕێژم؟

بژانگی تۆ دڵی کردوومە بێژنگ

کوڵ و خوێنی ئەوینێ دادەبێژم



١- ئەم تاک بەیتە هی شاعیری بەناوبانگی موکریان، هێمنی مەهابادیە.

١٣

له گوارەی پڕ پـەرەنگ دڵ پڕ پـەرەنگم

چەماوی بەژن و باڵای شۆخ و شـەنگم

لەسەر سینگی سـپیت چـاوم سـپی بـوون

له تاوی زەردە لیمـۆت زەردە ڕەنگـم

١٤

لـە قەنـدی لێـوی تۆیـە ژیـنی تاڵـم

له سووری کولمەته بـەخوێن شەلاڵـم

لـە دوو مـەمکی خـڕت بـیرم بـڵاوە

کـولاو و کۆڵـەواری سـێوی کاڵـم

١٥

بەدڵ گیرۆدە بەو پرچی بەچینم

ڕەش و ئاڵۆزە وەک ئەو بەخت و ژینم

دڵت گرتم خەیاڵی خۆت تیا دی

خەوت بردم کە لەودا تۆ دەبینم

١٦

وەرە ئەی بەندی جەرگ و ماکی ژینم

وەرە هەتوانی گش دەرد و برینم

شەوی ڕەش ڕۆژی ڕوونی بەختی من بوو

کە لەودا تۆ نزیکی خۆم دەبینم

١٧

گـراوی داوی خـاوی سـەر بـڕاوم

کـوژاوی چـاوی مەسـتی نیـوە خـاوم

لە تیشکی ڕوومەتت سەردە هەناسـەم

کـز و بـێتـینی ئـەو بـەژنی زراوم

١٨

جگەر لەت-لەت بە ئەبرۆی تازە ساوم

لـەپت سـوورە لـە خوێنـاوی ڕژاوم

خەیاڵـم پەرتـە بـۆ خرخاڵـی قۆڵـت

زڕەی لەرزانەکـەت بـردی زراوم

١٩

چ خۆشــە پاشــی ئــەم تۆرانــە ســازان

چ شـــیرینە وتـــەی ڕاز و نیـــازان

بەسم بێ جەزرەبەی شەوگاری دووریـت

پتـر مەیهەنجنــە جــەرگم بــە نــازان

٢٠

شەوە ئەستێرە بەزریوەن لـە سـەرمان

لە مانگی ڕووت هەناسەم بۆتە خـەرمان

تکەی ئاونگی کولمت تـەڕ دەکـا لێـو

گەزۆ باری لـە گـەرمان و لـە شـەرمان

## ٢١

پـلاری تـۆن کـە دڵ چـڕژاوە ئەمشـەو

جخاری تۆن کە خوێن پڕژاوە ئەمشـەو

مزەم چی بوو لە چاوی مـامزی مەسـت؟

کە جەرگم بۆ مەزەی بـرژاوە ئەمشـەو

## ٢٢

لە چەشـنی ئـاگرن کولـمی گەشـی تـۆ

لە مار حەستەم ترن پرچی ڕەشـی تـۆ

بڵێم وەک چی دەچی؟ هەر گوڵ دەزانم

لـە گـوڵ ناسـکترە ناسـک لەشـی تـۆ

## ٢٣

دڵم تەنگە وەکوو خونچەی دەمــی تـۆ

سـەرم گێـژە لـە گێـژی پەرچـەمی تـۆ

دڵ و گیـان و ژیـانم دا بـە ماچێـک

وتـت پێـک نایـە زۆری مـن کـەمی تـۆ

## ٢٤

ژیانم چـوو، هـەژار و دەسـتەو ئـەژنۆ

چلۆن ڕوویداوە دەست و گـەردنی تـۆ

ژیانی دوایەشم بـۆ تـۆ خـودای شـەو

بەرەو ڕۆ خۆش مەڕۆ تۆزێک لەسەرخۆ

٢٥

له لێوت زامی جەرگم پڕ نمـەک بـوو

له سێوت خەم لە ناو سینەم کەڵەک بـوو

لـە سـایەی گـەردنی تـۆ بـام وچانـێ

لـە ئـەولاش داری تووبـام ناگـەرەک بـوو

٢٦

لە دەست ئەو چاوە مەستەت نیمە چارە

لــە نــاخێم ڕادەکــەن دەرد و پــەژارە

لــە کێلــی گۆڕەکــەم یــاران بنووســن

کــوژاوی گــەردنی کێلــە و هــەژارە

## ٢٧

گوڵی باخان لە شەرمی کوڵمە سوورە

لە ڕووی ئەو پەلکی گوڵ ئەستوورە، زوورە

گوتم مردم نەگەیمە ماچێ، فەرمووی

هەژار بمبوورە! دوورە ئەو سنوورە

## ٢٨

هەتا مردن لە دڵدا سینە ماکە

دڵت چەند چاکە دڵداریت چ پاکە

لە تاریکایی دۆستی دەست لە ناو دەست

کە تیشکی دا چراکە بوومە کاکە!

٢٩

زمان بۆ پەسنی ئەو لێو ئاڵە لاڵە

گلێنەم تانە داری دانە خاڵە

بەپیری چووم بەرەو پیری منالی

دڵی بردووم کچۆلێک چاردەساڵە

٣٠

لەگەڵ تۆدا کەسێکی دەمدەمانە

چ کارێکی بە خۆشی پاش نەمانە؟

مەی و کەوسەر لە گۆشەی لێوی ئاڵە

بەهەشتی خۆش لە شێوی ناو مەمانە

٣١

ددان مــرواریــە و هەریــەک لەوانــە

لــە نرخــا گــەنجی قــاروون ناتەوانــە

لە سووچی لێوەکـەت خاڵـێک دیـارە

لــە گــەنجت بێچـوە زەنگـی پاســەوانە

٣٢

بە گریەم پێکەنی خەندەت بـە شـینە

دەڵێی پـاش گریـە نـۆرەی پێکەنینـە

دڵت گەر سەدیەکی سـینگت نـەرمبـا

نەرم بووی ئێستە بۆ ماچێـک لەسـینە

## ٣٣

شەوە لەو سەوزەزارە لەو دەم ئاوە
مەکۆی خەم لاچووە دەمکوڵ چماوە؟
مەکە و لاچۆ و دەمانبینن بیانوون
بەیانە و دەم بنێ دەم، دەم نەماوە

## ٣٤

بە داوی کەزیەکەت دڵ دالەقاوە
بژۆڵت ڕێزە نێزەی تێ چەقاوە
وچانێک لێوی قەندم پێ ببەخشە
جگەر برژاوە گەر پێت خۆشە قاوە

٣٥

وەرە تاوێکـــە گوڵـــزارت نـــەدیوە

لـە تـاوت خونچـە سـینەی دادڕیـوە

وەنەوشە دوور لە باڵات خۆی دەهەش نا

هەڵاڵـە زەردە، نێرگـز ڕەنـگ پـەڕیوە

٣٦

دەبێ بەکوێ بگەی هێشتا نەگـەیوی؟

لە ڕوخسارا بەهەشتی، ڕۆژی، هـەیوی

هــەزاران داود و دەنگــی زەمــووری

دەبــەر لێـوت مـرن کاتـێ دەپـەیوی

## ٣٧

کش و ماتە جیهان لە ژوانی لـە نـوێ

گـەلاوێژ بۆمـە دەڕوانـێ لەسـەر سـوێ

چریکـــەی بولبولێـــک دێ وا دەزانم

چپەی ماچی من و تۆی هاتـە بـەرگوێ

چارەڕەش بووم و لە ڕێی خاڵی ڕەشا بێچارە مام
دەک چ گیان‌سەختم کە من تا ئێستە هەر لەو بارە مام
«من لەگەڵ مەجنوونێ هاوڕێ بووم لە ڕێی شێتی و ئەوین
ئەو گەیی بە نیاز و من هەر بێدڵ و ئاوارە مام»[1]
بۆ هەرووژمم کەوتە کار شیری برۆ و تیری مژۆڵ
کون-کونی دڵ دوور لە هەژمار و جەرگ سەد پارە مام
گوڵ بەدەن ئەمڕۆ لە گوڵزارا گوڵی پشکووتبوو
گوڵ دەپشکووتن لە دەم، سەرسامی ئەو گوڵزارە مام
بولبولێ لە دیاری گوڵ دڕکی لە قاچی ڕا دەچوو
من بە دڵما چوو لە سەیری ئەو گوڵی بێ خارە مام
شەوڕەشی پرچت دڵی ساوامی وا دێوانە کرد
هەر لە منداڵیمەوە بەو تارەوە پەتیارە مام
پێم دەڵێ ڕەنگ زەردی وەک لیمۆی هەژاری، من وتم
ڕەنگ نەماوی ئەو نەمامی بەژنی لیمۆ دارە مام



١- ئەم بەیتە لە فارسییەوە وەرگێڕدراوە.

## ژوانێك

یـــــارە جوانەکــــــەم گوڵەی شۆخ و شەنگ
خونچیلانەکـــــــەم دڵگوشای دەم تـەنگ

سەر کولـمی گەشت بــرەو بــەری گــوڵ
خــوا داویــە بەشــت گشـــت نیـــازی دڵ

بــە قــژی زێــرینت بــە لێــوی ئاڵـــت
بــە چــاوی شــینت بــە دانــەی خاڵــت

زەرد و بــێ تیـــنم شەتڵــی خوێنـــاوم
خـــەریکی شـــینم تانــــە لــــە چـــاوم

زانیـــت دەمــــردم بــەو بــەژنی باریــک
ڕزگـــارت کــــردم لــە ژیــانی تاریــک

ئەمشەو وەدیارە      قەدری دڵانە
جەنگەی بەهارە      مانگی گوڵانە

چاو جوان دەمێکە      ئەوینداری تۆم
زامم گەلێکە      برینداری تۆم

منێکی بێ هەڵ      هەژاری کڵۆڵ
پیر و ددان کەل      وەک داری کرمۆڵ

کز و بیمارم      خەمبار و سەرشۆڕ
وا لە سەر بارم      بۆ گۆڕ چاوەنۆڕ

کەی بیرم دەبرد      جوانێکی وەک تۆ
سەد لاو بۆت دەمرد      گیانێکی وەک تۆ

تۆی شلک و ناسک      تۆی وا نەرم و نۆڵ
تۆی سڵ وەک ئاسک      تۆی وا خڕوخۆڵ

وەک تۆ نازدارێک      ئەویش وا بەشەو
هامێزم جارێک      بکا بەجێ خەو

لەو تاریکایە      بەو شەوە خۆشە
هەتا هەتایە      دڵ بۆی پەرۆشە!

ـه سێله چاوێک    زیندوو بوومەوە
وەک تازە لاوێک    تێ هەڵچوومەوە

ئەمە تۆی ئەمشۆ    لە ناو باوەشم
دیتم لە ئاسۆ    ئەستێرەی گەشم

ئەو سینەی نەرمت    لە دڵ چەسپاندم
تارمایی شەرمت    لە ڕوو تاراندم

دەخشێن لە لێوت    لێوی بەبارم
لەکوڵمی سێوت    گۆنەی نزارم

لە باغی ساوای    پاوانی سینە
پەنجەم سەرگەرمی    لیمۆ کوشینە

ۆخەی وا دیسان    خۆشیم دی شەوێک
ـەویش بۆ ژیان    لێم بوو بە خەوێک

هەتا بۆ ژێر گڵ    گلار بوونەوەم
ـاخوازم بە دڵ    بێدار بوونەوەم

## ڕیز و ژمارەی چوارینەکان بە تەرتیبی پیت و وشەی سەرەتایان

| ڕیز | بالی یەکەم | لاپەڕە | ژمارە |
|---|---|---|---|
| ١ | ئاخ خۆزگە لە مردنا بە مەی شۆراوم | ٢٩ | ٥٧ |
| ٢ | ئای خۆزگە ببایە جێگە بۆ سانەوەیەک | ١٤ | ٢٧ |
| ٣ | ئۆخەی کە نەما باوی خەیالی خالی | ١٠٤ | ٢٠٨ |
| ٤ | ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ لە عاسمانانن | ٤٣ | ٨٥ |
| ٥ | ئەستێرە هەمووی ئەگەر درشت و وردن | ٣٨ | ٧٦ |
| ٦ | ئەم بادەیە گیانە چۆتە لاشەی پیالە | ٦٧ | ١٣٣ |
| ٧ | ئەم بوون و ژیانەی هەیە چۆن ڕوویداوە؟ | ٧٩ | ١٥٨ |
| ٨ | ئەم پیالە وتی کە هاتە سەر لێوانم | ٢٥ | ٥٠ |
| ٩ | ئەم جارە پەلاسی شەرم و دین پارە دەکەم | ٣٣ | ٦٥ |
| ١٠ | ئەم خەلکە لە کارگای خودا دێتە دەرێ | ١١٥ | ٢٢٩ |
| ١١ | ئەم ژینە کە ڕابرێ، چ شیرین و چ تاڵ | ١٦ | ٣١ |
| ١٢ | ئەم کۆنە سەرا و پەردە کە دنیای ناوە | ٨٣ | ١٦٦ |
| ١٣ | ئەم گۆزە کە جێ ئاوی کرێکارێکە | ٦٣ | ١٢٥ |
| ١٤ | ئەم گۆزە وەکوو من بووە: دلدار و هەژار | ١٠ | ١٩ |
| ١٥ | ئەم هاتن و چوونی ئێمە چی لە دوایە؟ | ٩٣ | ١٨٥ |
| ١٦ | ئەو جوانە کە خۆم دەلێم بە تەنیا جارێ | ١١٣ | ٢٢٥ |
| ١٧ | ئەو خوایە کە گەردوون و زەوی بەرپا کرد | ٩ | ١٨ |
| ١٨ | ئەو ڕۆژە خودا سازی گیانی ڕانا | ٣ | ٥ |

